سالی حەوتەم

82

نیسانی ٢٠١٥

یەکەمین گۆڤاری کارگێڕیو گەشەپێدانی مرۆیی لە کوردستاندا



لە پێناو گەلێکی خاوەن بڕیاردا

# بڕیار



مانگانەیەکی تایبەتە بە کارگێڕیو گەشەپێدانی مرۆیی

## لەگەڵ تۆراوی شاعیردا

## مەدرەسەکەی تۆ

لەم ڕۆژگارە سەختەدا، بەهێز بە!

چۆن بەڕێوەبەرەکەت بەڕێوە دەبەیت؟

نیگایەکی میهرەبان!

زیرەکی و زیرەکیی هەمەچەشنە

پێوەرەکانی هاوسەری سەرکەوتوو

منداڵ، کام ڕەوشتەی تۆ وەردەگرێت؟

ئەم بەرهەمە ناوازانەی بڕیار
کەوتە بەردیدەی خوێنەرانی ئەزیز













لەبەرواری ٢/٤/ ٢٠١٥ بۆ ١٢/ ٤/ ٢٠١٥
لەپێشانگای نێودەوڵەتی کتێب لە هەولێر،
خانەی G3 پێشوازیتان لێدەکەین

**خاوەنی ئیمتیاز**

ئەندازیار:

مەسعود تـاهیر ڕۆژبەیانی

**سەرنووسەر**

عادل محەممەد شێخانی

sarnosar@yahoo.com

**بەڕێوەبەری نووسین**

بەرزان ئەبوبەکر

**دەستەی نووسەران**

ئەسکەندەر ڕەحیم

بێگـەرد فــــارس

زاهـیــــر زانـــا

محەممەد مێرگەیی

محمد هاشم محمد

وەهـاب حەسـیب

یەحیـــا محەممەد

گولاڵن حەمەئەمین

**ڕاوێژکاری یاسایی**

پارێزەر:- ئازاد محێدین

**بەشی هونەری و دیزاین**

پشتیوان عبدالرحمن

**تایپ**

کلسوم جەلال


# No: 82


**ناونیشانی گۆڤار**

سلێمانی - شەقامی سالم -تەلاری جەمالی حاجی عەلی-

نهۆمی چوارەم- یەکەی (٤٠١) نزیك پردی خەسرەو خاڵ

٠٧٤٨٠١١٢٧٨٧ - ٠٧٧٠٢١٧٨٦٨٢

هەولێر

٠٧٥٠٤٤٦٣٢٣٠ - ٠٧٥٠٥٢٥٣٠٣٥

E-mail: bryarmagazin@gmail.com


bryarmagazine



**دابەشکردن**

کۆمپانیای پەیك/ 07708649210

**چاپ**

کۆمپانیای پیرەمێرد




**مانگانەیەکی تایبەتە بە کارگێڕیو گەشەپێدانی مرۆیی**

**ساڵی حەوتەم - ژمارە 82 - نیسانی 2015**







# کارگێڕیو بازاڕسازی




# لەم ڕۆژگارە سەختەدا، بەهێز بە!

دەزانم ڕۆژگار سەختەو کەس نکووڵی لەمە ناکات، داوای ئەوەشت لێ ناکەم، لە ئاست ئەم ڕاستییە، چاوپۆشی بکەی!

بەڵام تەنها دەمەوێت بەیەکەوە سەرکەوتووانە، لەگەڵ ئەم ڕۆژگارە سەختەدا، مامەڵە بکەینو دەستەوەستان دانەنیشین!

ڕۆژانە نەبینە بیسەرو بینەری هەواڵی شەڕو کوشتارو ڕووداوی جەرگبڕ.. خەمو پەژارە، دڵو دەروونمان داگیرنەکاو وامان لێ نەکات، لە خودی خۆشمان بێزار بین!

گرفتە یەك لەدوای یەکەکانو بارودۆخی سەختی ژیانو سیاسەتە ئەهریمەنەکان، وایان لە هەزاران هەزار کەس کردووە، کە جگە لە ئاخو ئۆفو پەنابردن بۆ خۆدزینەوە لە واقیع، هیچی دی ئەنجام نەدەن!

ئێمە لە زەمەنێکدا دەژین، لەبەر زۆریی شتەکانو پێویستی مرۆڤ بۆیان، دەسەڵات لە مرۆڤەوە، گۆڕاوە بۆ شتەکانی دەوروبەر!

مرۆڤ، زۆرترین هێزو دەسەڵاتو تواناو بەهای خۆی لە دەست دەدات؛ بۆ بەدەستهێنانی ماددیاتی دەوروبەری!

جیهانگیریو یەك سیستەمیی کۆمەڵایەتیو ژیانو زیندەگی، وا دەسەڵاتی پەرەی سەندووە، کە مرۆڤ زۆرجار، بێئەوەی قەناعەتی پێ هەبێت، پەیڕەوی لەو سیستەمە دەکات؛ لە جلوبەرگو خۆراكو شێوازی ژیانی ڕۆژانەدا! چونکە ئەو شتانە کراونەتە پێوەرو مرۆڤی پێ دەدرێ لە مەحەك!

هاوکات لە وەها ژینگەیەکدا، پارێزگاری لە بەهاو بنەما فیکریو ئەخلاقییەکان سەختەو ڕۆژ بە ڕۆژ سەختتر دەبێت.

بەڵام ئێمە نابێت، هەرگیز دەسبەرداری بەهاو بنەماکانی خۆمان بین؛ چونکە ئەوە، مانای توانەوەو ونبوونو نەمانە!

ئێمە، لەبری ئەوەی لەنێو ئاڵۆزیی ژیاندا، خۆمان ونکەینو هەوڵبدەین؛ بۆئەوەی لە کاروانی سیستەمی گشتی جێ نەمێنین.. خۆمان بگونجێنینو لەسەر داواکاریی ئەم ڕۆژگارە، خۆمان قورمیش بکەین!

پێویستمان بە فێربوونو ڕاهێنانی زیاتر هەیە، تا بتوانین لەم ڕۆژگارە سەختەدا، سەربەرزانەو سەرکەوتووانە بژین!

پێویستە بە خوێندنو خوێندنەوەی زۆر، بە فێربوونو ڕاهێنانی بەردەوام، ئامانجی گەورە دیاری بکەینو بۆ گەیشتن بەو ئامانجەش، بێ وچان کار بکەین!

ئازادانە بژینو هەرگیز دەستبەرداری ئازادیی خۆمان نەبین، ڕێگە نەدەین قەیرانو فشارەکان، بنەماو بەهاو ڕێبازی ژیانمان بگۆڕن!!

پێویستە بەتەواوی، کۆنتڕۆڵی ویستو ئیرادەی خۆمان بکەین، بەڕێوەبردنی خود، سەرەتای ڕێکخستنی هەموو هەنگاوەکانمانە!

با ئامانجمان، بەرزو بڵندو ئاشکراو ڕوون بێت؛ چونکە بەهای ژیانی ئێمە، بەو ئامانجانەوەیە، کە لە پێناویاندا دەژین!

با سوور بین لەسەر ئەوەی کە دەبێت سەرکەوینو هەرگیز کۆڵ نەدەین!

باهەمیشە درووشممان لە کارەکانمادا ئەوە بێت: "یان سەر دەکەوین، یاخود سەر دەکەوین!"

با هەوڵ بدەین نموونە بین، پێشەنگ بین، با لەو ڕێژە کەمەبین، کە سەرکردایەتیی مرۆڤایەتی پێ سپێرراوە!

لە هەمووی گرنگتر، کارگێڕێکی باشی کاتەکانمان بین؛ چونکە بەڕێوەبردنی کات، واتە: بەڕێوەبردنی تەمەن!

ئازیزانم، لەم ڕۆژگارە سەختو دژوارەدا، ئێمە سەرقاڵی کارەکانمانین، کاتمان نەماوە، بۆ پێشوازیی خەمو پەژارەو ترسو نیگەرانیو بێزاریی.. لای ئێمە ژیان، پڕە لە چالاکیو گورجوگۆڵیو بەرنامەی خۆش!!



# کارگێڕی بە گوفتار

کەسی پسپۆڕو شارەزا
لە بچوکترین شوێندا خاوەنی
گەورەترین شارەزاییە.

ستانلی هایغ

خراپترین شکست ئەوەیە:
کە هەوڵ بۆ سەرکەوتن
نەدەیت.!

الفرد نوبل

دادپەروەربە، پێش ئەوەی
بەخشندە بیت!
چونکە پێداویستییەکان
پێش جوانکارییەکانن!

شامفور

کتێب لە منداڵیدا ڕێنمایت دەکات،
لە گەورەییدا دڵنەواییت دەکات،
لە تەنیایدا هاوڕێیەتیت دەکات!

جونسون

لەبری ئەوەی ماسییەک ببەخشیت
بە هەژارێك،
قولاپی ماسیگرتنی پێشکەش بکە!

پەندێکی چینی

# با خۆری تۆ هەڵبێ!

لــە بەرەبەیانــی ڕۆژێکدا، پێش هەڵاتنی خــۆر، ڕاوچییەکە، گەیشــتە کەناری ڕووبارەکە، لە ڕێگادا، پێی لە شتێك هەڵکەوت، تەماشای کرد، کیسەیەکی پڕ لە وردە بەردە!

کیســەکەی هەڵگرتو لە کەنار ڕووبارەکە لێی دانیشــتو لە چاوەڕوانــی هەڵاتنی خۆردا؛ بۆئەوەی دەســت بە کارەکەی بکات، کیســەکەی هێناو، دانە دانە، بەردەکانی دەردەهێناو فڕێی دەدانە نێو ڕووبارەکەوە.

خۆی بەو کارەوە دەخافڵاندو دەنگی کەوتنە خوارەوەی بەردەکانی پێ خۆشــبوو! لەبەرئەوە، بەردەوام بوو لە فڕێدانی بەردەکان، یەك لــە دوای یــەك.. تا ئەو کاتــەی خۆر هەڵات.. ئــەو کات، تەنها یەك بەردی لە نێو چنگدا مابوو، بەڵام کاتێك تەماشــای کرد، باوەڕی بە چاوی خۆی نەکرد، ئەوەی لەنێو دەستیدا بوو، ئەڵماس بوو!!

بەڵێ، کیســەیەك ئەڵماســی فڕێ دابووە نێو ڕووبارەکە! لەو کیسەیەش، تەنها یەك دانەی بە دەستەوە مابوو!

ڕاوچــی، دەســتی کــرد بــە گریــانو شــین؛ بۆ ســەروەتی لەدەستچووی!

دەگریــا بۆ بەختی خۆی.. بۆ ســەروەتێك، کە هەموو ژیانی دەگــۆڕی! بەڵام لەنێو تاریکیــدا، هەمووی فڕێدایە نێو ئاوەکەوە، بێئەوەی هەستی پێ بکات!

بەڵام هێشــتا، ئەم کرێکارە بەختی باش بوو، چا نییە؛ پێش ئەوەی دوا ئەڵماس فڕێ بدات، خۆرهەڵات!!

**لەم چیرۆکەوە فێر دەبین:**

١. ئەگــەر چاوت تیژ بێتو بەجوانی شــتەکان ببینیت، ئەوا دەبینیت خۆری ناخت، ڕێگات بۆ ڕووناك دەکاتەوە.

٢. ئەگــەر لە ژیاندا، وریاو وردبین نەبیت، زۆر شــت هەیە، نایبینیتو زۆر هەل لەدەست دەدەیت.

٣. نابێــت هەر چاوەڕێی ڕووناکی دەرەوە بین، بەڵکو دەبێت، بە نوورو ڕۆشــنایی ناخمان، لە تاریکترین ســاتەکاندا، شــتەکان ببینین.

٤. تا چرای هیوا، لە ناخمانەوە نەسووتێ، ناگەین بە کازیوەی ئاواتو ئامانجەکانمان.

٥. ئەگــەر هــەر چاوەڕێــی خــۆری کازیوە بیــن، زۆرێك لە ئەڵماسەکانمان لەدەست دەچێتو هەڵاتنی خۆر، زۆر دوا دەکەوێت، بەتایبەت ئەگەر ئەو ڕۆژە، وەیشوومەو هەور بێ!!

# تەنها بۆ سەرکردەکان

**جوزیف ئەدیسۆن**

ترسنۆک لە کاتی ڕووبەڕووبوونەوەی مەترسیدا، بە قاچەکانی بیردەکاتەوە.

**مدام جیراردان**

خیانەت وەکو مەرگ وایە، دەست لەکەس ناپارێزێت.

**ڕۆنییە**

کەسە ئازاکان، لە مەترسییە گەورەکاندا دەردەکەون!

**هزیودس**

ئاشتی دایکێکی میهرەبانە، بۆ هەموو وڵاتێک..

**پەندێکی عەرەبی**

دونیا دوو ڕۆژە، ڕۆژێک بۆ تۆیەو ڕۆژێک دژی تۆیە..
لەو ڕۆژەدا کە بۆ تۆیە، لە خۆت بایی مەبە.
ئەو ڕۆژەش کە لە دژی تۆیە، نیگەرانو بێتاقەت مەبە.



# هێزی بڕیاردان

طارق السویدان

و: دەرباز ئەحمەد

بیرۆکەی یەکەم لەم باسەدا ئەوەیە کە: سەرکەوتن بریتییە لە گەیشتن، نەوەك وێستگەو شوێنی وەستان، لە کاتێکدا زۆربەی گەنجان وا دەزانن کە سەرکەوتن خاڵێکی دیاریکراوە، پێویستە گەنج پێی بگات، ئیتر لە دوای ئەم خاڵەوە سەرکەوتن بوونی نامێنێت، نەخێر بەڵکو سەرکەوتن وەستانی بۆ نییەو لە هەموو پلەیەکدا هێشتا سەرکەوتنی بەرەو سەرتر، بوونی هەیە.

لەگەڵ ئەوەشدا پارێزگاریکردن لەو سەرکەوتنەی کە بەدەستت هێناوە، سەختترە لە گەیشتن بەو سەرکەوتنە، زۆرن ئەوانەی ویستویانە دەوڵەمەندبن، سەرەنجام پێی گەیشتوون، بەڵام پارێزگارییان لێ نەکردووەو دواتر هەموو سامانەکیان لەدەست داوە؛ چونکە نەیانتوانیوە پارێزگاری لێ بکەن، یاخود زۆر کەس ویستویانە کۆلێژی پزیشکی بەدەست بهێنن، بەدەستیان هێناوە، بەڵام لە ناوەڕاستی خوێندنی پزیشکی سەرکەوتنەکەیان لەدەست داوەو ئێستا لەسەر شەقام کاری ئازاد دەکەن، چونکە پارێزگارییان لەسەرکەوتنەکەیان نەکردووە، هەروەها زۆرن کە بە دوای ناوبانگدا گەڕاونو بەدەستیان هێناوە، بەڵام دوای بەدەستهێنانی پارێزگای پێ نەکراوە لەسەرکەوتنەکەیو کەسایەتی خۆی لەکەدار کردووە، کەواتە سەرکەوتن پێویستی بەپارێزگاریکردنە.

لێرەدا پرسیارێکی بنچینەیی دێتە ئاراوە:

ئەو سەرکەوتنە چییە کە من دەمەوێت بەدەستی بهێنم؟

بۆ وەڵامی ئەم پرسیارە، پێویستت بە بڕیاردانە، بە بڕیاردان دەزانیت کە تۆ چیت دەوێت؛ بۆئەوەی بەدەستی بهێنیت.

پرسیارێکی دیکە: ئەو ڕێگایانە چین کە پێویستە بیگرمە بەر، بۆ گەیشتن بەو سەرکەوتنە؟

بەهەمان شێوە، بۆ وەڵامی ئەو پرسیارەش، پێویستت بە بڕیاردان هەیە.

پرسیارێکی دیکە: ئەو کێشانە چین کە ڕێگای سەرکەوتنم لێ دەگرێت؟

بۆ وەڵامی ئەو پرسیارەش پێویستت بە بڕیاردانە، بەڵام با وریای ئەم خاڵە بین، گەر بمانەوێت تووشی هیچ هەڵەیەك نەبین، هەرگیز ناتوانین، بەڵام پێویستە هەمان هەڵە دووبارە نەکەینەوە، ئەمە خاڵێکی ئێجگار گرنگو فەلسەفییە، کە هەرگیز هەمان هەڵە دووبارە نەکەینەوە، ژیان بریتییە لە زنجیرەیەك وانە، کە پێویستە فێریان ببین، لێرەدا یاسایەکی زۆر گرنگ دێتە پێشەوە:

(گەر دووجار پرسیار بکەیت، باشترە لەوەی جارێك هەڵە بکەیت)، لەم بابەتەدا پێشەوا (سەلامی خوای لێبێت) مەبدەئێکی سەرەکی پێشکەش بە ئێمە دەکاتو دەفەرموێت:

(ئیماندار دووجار ناکەوێتە چاڵێك)، (لایلدغ المؤمن فی حجر مرتین).

ئەگەر جارێك هەڵە بکەیت ئاساییە، بەڵام شەرمە ئەو هەڵەیە دووبارە بکەینەوە، ئەگەر لە هەڵەکانمانەوە فێر نەبین، ئەوا هەمان هەڵە دووبارە دەکەینەوە.

* لێرەدا پێناسەیەکی کورتی بڕیاردان دەکەین، بەشێوەیەکی زانستیانە.

بریتیە لە کرداری پرۆسەی هەڵبژاردن لە نێوان یەدەکەکان بۆ بەدەستهێنانی ئامانج، هەر کاتێك یەدەکەکان زیادیان کرد، بڕیاردان باشتر دەبێت، بۆ نموونە ئەگەر بمەوێت خانوویەك بکڕم، ئەوا تاخانوی زیاترم لە بەردەستا بێت، بڕیاردانەکەم باشتر دەبێت، بەشێوەیەکی زانستیانە.

بۆیە پێویستە یەدەکەکان لەبەر دەستمان زۆرتر بکەین.

ئایا هەڵبژاردنی یەکێك لە یەدەکەکان بە پێی مەزاجی ئێمەیە؟ نەخێر، بەڵکو چەند ڕێگایەکی زانستییانەمان لەبەردەستادایە بۆ هەڵبژاردنو بڕیاردان، نموونەی ئەم ڕێگایانە (Matrix، Decision Tree، Fishbone ) کە پێویستەو باشترە فێریان ببین، لێرەدا ئێمە تەنها ئاماژەیان پێ دەکەین.

هەنگاوەکانی بڕیاردان:-

هەنگاوی یەکەم: مەبەستی بڕیارەکەت دیاری بکە.

هەروەها زۆریش گرنگە بزانین بۆچی ئەو بڕیارە دەدەین؟

بۆ نموونە من دەمەوێت ئۆتۆمبێلێکی گرانبەها بکڕم، پێویستە لە خۆم بپرسم بۆچی دەمەوێت ئەو ئۆتۆمبێلە بیکڕم.

هەنگاوی دووەم: ڕاوێژکردن پێش بڕیاردان:

پێویستە بزانین ڕاوێژ بە کێ دەکەین، پێش بڕیادانەکە، هەروەها وەك پێشتر وتمان سوود لە هەڵەکانی خۆت وەربگرەو لێیانەوە فێربە، ئێستا دەڵێین: لە هەڵەکانی خۆتو هەڵەکانی کەسانی دیکەوە فێربەو پەندیان لێوەربگرە، پرسیارو ڕاوێژ بەو کەسانە بکە کە ئەزموونیان زۆرەو هەڵەی زۆریان کردووە، لە هەڵەکانیانەوە فێربوون، نموونەیەك دەهێنینەوە لە بارەی ڕاوێژکردن بە کەسی ناشایستە: ئافرەتێك کێشەی لەگەڵ هاوسەرەکەیدا دەبێت، دەڕواتە لای خوشکەکەی بۆ ئەوە پرسی پێ بکات، لە کاتێکدا خوشکەکەی کچەو هاوسەرگیری نەکردووە، کەواتە ئەمە هەڵەیە، چونکە پێویستە ڕاوێژ بە کەسی گونجاوو بە ئەزموون بکەین.

لێرەدا وتەیەکی جوان هەیە کە دەڵێت: (پەند لە خەڵکانی ترەوە وەربگرەو مەبە پەند بۆ خەڵکانی تر)!

هەنگاوی سێیەم: یەدەکەکان زیاد بکە:

وەك وتمان تا هەڵبژاردنەکانی بەردەستت زۆرتر بێت، بڕیارەکان باشتر دەبن، ڕاستە هەڵبژاردەی یەدەکی بەردەستت باشەو گونجاوە، بەڵام ئەویان بخەرە یەدەکەوەو بەدوای هیتردا بگەڕێ، لە ڕێگای سەفەرکردنو گەشت بەجیهاندا، یاخود لە ڕێگەی داهێنانی شتێکدا کە پێشتر کەس تر نەیکردووە.

هەنگاوی چوارەم: لە نێوان یەدەکەکاندا، باشترین یەدەك هەڵبژێرە:

هەڵبژاردنی باشترین یەدەك بەشێوەیەکی هەڕەمەکی گونجاو نییە، بەڵکو پێویستی بە لێکدانەوەو شیکردنەوەی بابەتەکانە بە وردی.

هەنگاوی پێنجەم: بڕیارەکان بخەرە بواری جێبەجێکردنەوە:

بۆچی بابەتی بڕیاردان ئەوەندە بە گرنگی وەردەگرین؟

لەبەرئەوەی ژیانمان بریتییە لە کۆمەڵێك بڕیار، کە ئێمە دەری دەکەین، ئەو کەسەی کە نوێژ ئەنجام دەدات، بڕیاری داوە کە نوێژ ئەنجام بدات، ئەوەی کە ئەنجامی نادات بڕیاری داوە کە ئەنجامی نەدات، کەسی شکستخواردوو بڕیاری شکستی داوە، کەسی سەرکەوتوو بڕیاری سەرکەوتنی داوە، کەسی تەممەڵ بڕیاری تەممەڵی داوە، زۆرێك لە خەڵکی پەشیمانن لەوەی کە بڕیاریان نەداوە، زۆرێکیان بە ئەزموونی تێپەڕیونو لێوەی فێرنەبوون، کەسی سەرکەوتوو مامناوەندە لە نێوان دوو لایەندا.

لایەنی یەکەم: جۆرە کەسێکە کە هەر هەڵە دەکاتو لێوەی فێر نابێت، سەرئەنجام هەمان هەڵە دووبارە دەکاتەوە.

لایەنی دووەم: جۆرە کەسێکە کە هەرگیز هەڵە ناکات، چونکە هەرگیز هیچ کارێك ئەنجام نادات.

کاتێك منداڵێك لە ئەنجامی کارێکدا هەڵەیەك دەکات، دایکی زۆر لێی تووڕە دەبێتو خۆی لێ گرژ دەکات، لێرەدا ئەو تووڕەبوونە پەیامێکە بۆ منالەکە کە پێی دەڵێت: هیچ کارێك نەکەیتو هیچ بڕیارێك نەدەیت، تەنها فەرمان وەربگرە جێبەجێی بکە، هەروەك سیستەمی سەربازیی، کە ئەمەش منالی شکستخواردوو بەرهەم دەهێنێت، ئابەم شێوەیە هەرگیز سەرکەوتوو نابین.



ئازاد محێدین

# گیرفان

کاتێ سێوێکت، ئەبێتە بەرکەوت
با لێت نەشێوێ سەرچاوەی دەسکەوت
بەر لە شۆردنەوەی بزانە حەڵاڵە
ئەرکی ئاو نییە، مەیکە بە گاڵە
ئەمجار بڕوانە لە شێوەی جوانی
لە فەزڵی خوداو نیعمەتەکانی
لەدەنکە تۆوێك بۆ نەمامو دار
خونچەو هەڵاڵەو فەریکەو بۆندار
کاتی دیاریکراو لە بۆ کامڵبوون
زۆر کامڵ هاتن، ناکامڵ دەرچوون
چاوێك بگێڕە بۆ دەوروبەرت
یا ئەو ڕێبوارەی دێتە گوزەرت
بەناوی خواوە بە وشەی جوانت
بەشداری بکە لە میوەو خوانت
بۆ حەرام، تەوبەو شەرمەزارییە
بۆ حەڵاڵ، حەمدو سوپاس گوزارییە
بەڵێنێك خودا بە ئێمەی دابێ
دڵمان لێوان لێو، با دڵنیا بێ
بە دەستی بەتاڵ بێ بەرگ و گیرفان
هاتینە دنیای پڕ مەینەتو ژان
بە دەستی بەتاڵ، کفنی بێ گیرفان
ئەگەڕێینەوە، ئەی خاوەن عیرفان

# چۆن بەڕێوەبەرەکەت بەڕێوە دەبەیت؟!

نەسیم سەمادی

ئەو دەمەی دادەنیشـــیتو بیر لەوە دەکەیتەوە؛ کە تۆ پێویستت بەوەیـــە: بەڕێوەبەرەکـــەت، بەڕێـــوە ببەیـــت، ئەوا ئـــەم کارە ئەوە دەگەیەنێـــت، کـــە یەکێکتان، یـــان هەردووکتـــان ناچالاکن؛ چونکە بیرکردنەوە لە خودی ڕێگەو شـــێوازەکانی بەڕێوەبردنی بەڕێوەبەر، بۆخۆی ئەو دەروازانەن، کە بۆ «سەرپەرشتیی گۆڕانکاری»، بەکاریان دەهێنیـــن، هەروەها ئەوە دەگەیەنێت، کە تۆ، لەبەر بوونی تەگەرەو خراپییـــەکان، لەو دۆخـــەی هەیە، ڕازی نیت.. یاخـــود لەبەرئەوەی دەوروبـــەر وات لـــێ ڕادەبینـــن، کـــە گۆڕانخوازیـــت، بۆیـــە هیوای باشترکردنی بەئەنجامگەیاندنی کارو ڕێژەی بەرهەمهێنانت هەیە.

ئەو کاتەی بیر لە بەڕێوەبردنی بەڕێوەبەرەکەت دەکەیتەوە، ئەوا لەســـەرەتادا، لە ڕێی کارتێکردنی باشـــەوە، بیر لە گۆڕینی ڕەفتاری دەکەیتەوە. منیش تا ئەم ساتە، پێنج ڕێگای گۆڕینی ڕەفتارم دیاری کردووە، ئەوانیش:

١. نەشتەرگەری: واتە: ئەنجامدانی نەشتەرگەرییەك لە مێشکی بەڕێوەبەردا، بۆ درووستکردنەوەی.. ئەمە ڕێگەیەکی ئاسانە؛ کاتێك نۆژداری مێشكو دەمار بیتو دەسەڵاتی فەرەفووشیت هەبێت.

٢. چۆرتمو بـــەڵا: واتە: لە خودا بپاڕێیتـــەوە، بەڕێوەبەرەکەت تووشـــی زەبرێکـــی زۆر تونـــدی دەروونـــی، یان جەســـتەیی ببێت، بەچەشنێك، کە بەقووڵی لە خاڵە لاوازەکانی بەئاگای بهێنێتەوە، تا هاوســـۆزی لەگەڵتدا بنوێنێتو ڕەفتاری بگۆڕێت، بەمەش خۆشـــحاڵ دەبێت لەگەڵتدا، یان خۆشحاڵت دەکات.

٣. زۆرو تۆبـــزی لێکـــردن: واتە: هێزی ناچارکردن.. وەك ئەوەی لای بەڕێوەبەرەکەی سەرووتری، یان لە دادگا، گازەندەی لێ بکەیت.. ئیدی بڕیارێکی یەکلاکەرەوەت دەســـت دەکەوێت، کە ناچاری دەکات، لەو شتەی لەبەر دڵت گرانە، پاشەکشێ بکاتو دەبێت بە فریشتەیەك، یان کۆیلەیەکی گوێڕایەڵو پێت دەڵێت: فەرمانت بە چییە؟

٤. پەندو ئامۆژگاری: یان هەڵسەنگاندنی سوود، ئەویش بەوەی، بەبێ بێزاری، درێژە بە دەرسو پەند ئامۆژگاریو چیرۆك گێڕانەوە بدەیت. ئەمەش ئاسانترین ڕێگایە، بەڵام دوورو درێژترینیشە.

٥. پێشەنگیو سەرمەشقی: بریتییە لە چالاکترینو کاریگەرترین ڕێگاو شـــێوازی سەرکردایەتی، بەڵام تەنها لەگەڵ ئەوانەدا بەرهەمی دەبێت، کە خاوەنی زیرەکییەکی بەرزی ســـۆزدارین؛ دیسانـ ئای لەو جیاوازییە! تەنها زیرەکە سۆزدارەکان دەتوانن.

بەو هۆیەی «پێشـــەنگی»، لە بەڕێوەبردنـــی بەڕێوەبەرەکانماندا، ئـــەو دەروازەی دڵخوازەیە، کە قووڵتریـــن کارتێکردنی هەیە، ئەمەش ســـەرەتا ئەوە دەگەیەنێت؛ کە بەڕێوەبردنی بەڕێوەبەرەکەت، هەرگیز لەگـــەڵ بەڕێوەبردنـــی کارمەندەکانتدا جیاواز نییە. بۆیە پێویســـتە ســـەرەتاو کۆتایی، لە ڕەفتاری خۆت بگەیت، تا بتوانیت خۆت بەڕێوە ببەیـــت.. چونکە تـــۆش، وەك بەڕێوەبەرەکەت وەهایت، گەر بشـــڵێین: بەڕێوەبەرەکـــەت وەك تـــۆ وەهایە، زیز مەبە؛ هەڵـــە دەکات چاکیش، هەڵدەچێـــتو هێوریش دەبێتەوە، هەمیشـــە باوەڕی وایە، کە لەســـەر هەقە، هەموو پێنجشـــەممەیەك، یان دەیان جـــار، جاڕی ئەوە دەدات، کە شـــێوازی بەئەنجامگەیاندنی کارەکان، باش دەکات. بەڕێوەبەر وەك مـــنو تۆ وایە؛ ســـوور لای وایـــە، کە هەڵەی کەســـانی دی، لە عەیبو نەنگییەکانی ناخیانەوە، سەرچاوەی گرتووە.. هەڵەی خۆیشی، هەمیشە لە گرفتو هەلومەرجە دەرەکییەکانەوەیە.

بەڕێوەبـــەرەکان، وەکـــو کارمەندەکانـــن؛ کاتیـــان دیاریکـــراوە، بیروهۆشـــیان جەنجاڵـــە، ئەوان فریشـــتەی بێهەڵە نین، شـــەیتانی شـــەڕەنگێزیش نین، ئەوان بێئاگا دەبنو خـــەون دەبینن، دەگرینو پێدەکەنن، دەســـڵەمنەوەو ڕچەشکێنی دەنوێنن، خواکردو سرووشتی مرۆڤانەیـــان هەیـــە.. پاشـــان هەرچی بڕســـتو توانینـــت هەیە، لە بەڕێوەبردنی پەیوەندییەکانت لەگەڵ بەڕێوەبەردا، بەشێوەیەکی باش، بەگەڕ بخە، ئەمەش بەرپرسیارێتیی تۆیە؛ چونکە **بەرپرسیارێتی، هەردەم دەکەوێتە سەر ئەستۆی ئەو کەسەی پێی دەزانێتو لێی تێدەگات، نەك لەســـەر ئەو کەسەی هەستی پێناکاتو بۆی بەخەم نییە!**

باشـــترین کەســـیش کـــە لەســـەر «بەڕێوەبردنـــی بەڕێوەبەر، وەك دەروازەی گۆڕانـــکاری» نووســـیویەتی، «جـــۆن کۆتەر»ە، کە دانەری کتێبی بێوینەی «ئەو کاتەی بەستەڵەکەکە دەتوێتەوە»یە، هەروەها « سەرپەرشـــتیی گۆڕانـــکاری»و «کرۆکـــی گۆڕانکاری»و «هێـــزی گۆڕانکاری» نووســـیوە.. ئەو پێی وایـــە؛ یەکەم هەنگاوی گۆڕانـــکاری، بریتییـــە لـــەوەی خـــۆت بناســـیت، پاشـــان ئامانجە تایبەتییەکانـــی بەڕێوەبەرەکەتو دەزگاو ڕێکخراوەکەت بناســـیت، هەروەهـــا ئاشـــنایەتیت هەبێت؛ لەگەڵ شـــێوازی هەڵســـووکەوتی بەڕێوەبەرەکـــەتو کارکردنیدا، بزانیت خاڵـــە لاوازەکانی چین، تا بیانپۆشـــیت، خاڵە بەهێزەکانیشی بناســـیت، تا تۆکمەیان بکەیت، جـــا جێی دەســـەڵاتی پایـــەدار بکەیت، ســـا لەبەرئەوە، پێویســـتە بەڕێوەبردنی بەڕێوەبەرەکەت، پشـــت بە بیرکردنەوەو تێڕوانینو ڕەفتاری دڵخوازو باشی خۆت ببەستێت؛ ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت، کە تۆ بچیت بۆ لای، تا: بپرسیت، نەك وەڵام بدەیتەوە.. ببیستیت، نەك بڵێیت.. ببەخشیت، نەك بسەنیت.. چارەسەری کاربکەیت، نەك بیئاڵۆزێنیت.. ئاســـانکاری بکەیت، نەك سەختکاری.. قسەی خۆش بکەیت، نەك پێداهەلگوتن.. گفتوگۆ بکەیت، نەك چەلەحانێ.. ڕێ خۆش بکەیت، نەك جێ چۆڵ بکەیت!

ن: د. عبدالكريم بكار

و: حسێن نەجمەدین قەرەداغی



# گەشەپێدانی تەواوکاری

بەشی 2

لە بەشی یەکەمی ئەم نووسینەدا، باسی گرنگیی زانستی گەشەپێدانی تەواوکاریو هەمەلایەنمان کرد، بە هۆکاری زیادبوونی ڕێژەی دانیشتووان لە وڵاتانی عەرەبیو ئیسلامیدا، ئێستا وەك نموونە، با وڵاتی جەزائیر وەربگرین، هەموو «٢٥» ساڵێك، ژمارەی دانیشتووانەکەی دوو بەرامبەر زیاد دەکات، پێشبینی دەکرێت ژمارەی دانیشتووانەکەی، لە ماوەی کەمتر لە یەك سەدەدا، بۆ «٢٨٥»ملێون کەس بەرز ببێتەوە.

لێرەوە، پێویستە ئەوە لەبەرچاو بگرین، کە گەلانی ئیسلامی، گەلێکی لاون، بەنزیکەیی نیوەی دانیشتووانەکەی لە منداڵو تازەپێگەشتووانن، کە تەمەنیان لە ١٥ ساڵ کەمترە.

ئەمەش نیشاندەری ئەو ڕاستییەیە، کە ژمارەیەکی زۆرتر لە دانیشتووان، پێویستییان بە خوێندنو هۆکاری دەستەبەرکردنی فێربوون هەیەو پاشان پێویستیی هەلی کارو خزمەتگوزارییە جۆراوجۆرەکان دێتە پێشەوە.

گەشەپێدان مانای ئەوە نییە، کە جەماوەرو دانیشتووانێکی بەربڵاوی ئاوەها لە ژیاندا بێتو ژیان بگوزەرێنێت، بەڵکو لەپێناو لەخۆگرتنێکی هەمەلایەنو گشتگیر، لە ڕووی کۆمەڵایەتیو ڕۆشنبیریو ئابووریو ...........هتدو ئاوەدانکردنەوە، تا بتوانێت بە ئەرکی سەرشانی مرۆڤانەی، لەم ژیانەدا ڕابگات.

٢- گرفتی ترسناکمان هەیە، پەیوەست بە ئاوی خواردنەوەو بەبیابانبوونو سەرچاوەی خواردەمەنی، ئەو داتاو ژمارانەی لەم لایەنەوە لەبەردەستە، سەرچاوەی دڵەڕاوکێیە، سەبارەت بە ئاو، بەشێکی زۆر لە وڵاتانی ئیسلامی لە ئەفریقیاو ئاسیا، گرفتی ئاوی خواردنەوەو ئاوی ئاودێرییان هەیە.

ڕاپۆرتی بانکی نێودەوڵەتی ئاماژە بەوە دەکات، کە سەرچاوەی ئاوی بەردەست، بۆ هەر تاکێك لە باکووری ئەفریقیاو ڕۆژهەڵاتی عەرەبی، کەم دەبێتەوە بە ڕێژەی (٨٠٪) لە تەمەنی یەك نەوەدا. ئەو سەرچاوەیە لە (٣٤٣٠) مەتر سێجاوە کەم دەبێتەوە بۆ (٦٧٧)م٣ ساڵانە، کە ئەمەش کەمترە لە لایەنی کەمی پێداویستیی داواکراو بە (٢٠٠٠) مەتر سێجا ساڵانە.

سەبارەت بە خواردن، وڵاتانی عەرەبی، لە ساڵی (١٩٨٥)ەوە (٢٠٠) ملیار دۆلاری خەرج کردووە، پێشبینیش دەکرێت، لە ماوەی ١٠ ساڵی داهاتوودا، ئەو بڕە بگاتە (٦٥٠)ملیار دۆلار. واتە: بە ڕێژەی ٢٠٠٪ زیادی کردووە.

پێشبینی دەکرێت؛ گرفتی خواردن ئاڵۆزتر ببێت، بەهۆی گرفتی سەرچاوەکانی ئاوەوە، بەهۆی پەیماننامەی (بازرگانیی جیهانی) بەناوی(الجات).

لە لایەکی ترەوە، تەنها ئێمە نین ڕووبەڕووی گرفتی کەمیو نەبوونی سەرچاوەکانی خۆراك دەبینەوە، بەڵام وڵاتە پێشکەوتووەکان، بەهۆی بوونی سەرچاوەی دارایی بەهێزو پێشکەوتنی پیشەسازی، دەتوانن ئەو گرفتە بۆ خۆیان چارەسەر بکەن.

بەڵام گرفتی گەلانی موسوڵمان، کە زۆرینەی پشتی بە کشتوکاڵ بەستووەو لە هەمان کاتدا ناتوانێت بەشی خۆی پێ دەستەبەر بکاتو سەرچاوەی تری داهاتی نییە، پێویستە خواردن بۆ منداڵەکانی پەیدا بکات، جا بە هەر نرخو باجێك بێت، لەبەرئەوە پێویستە لەم ڕووەوە پلانی باشترو درێژخایەنمان هەبێت، کە بە پشتیوانی خودا، لە بەشەکانی داهاتووتردا باسی دەکەین.

٣. کەمیی پێشبینیکراوی خواردن، دەرئەنجامی خراپی لێ دەکەوێتەوە، بەتایبەت بۆ منداڵ، کە دەبێتە هۆی جۆرێك لە ناتەواویی لاشەییو عەقڵیو سایکۆلۆژی، کەمی پرۆتین دەبێتە هۆی زیانگەیاندن بە مۆخو کەمیی ڤیتامین ئەی، دەبێت بە هۆی بەدخۆراکیو دەبێت بە هۆی کەمخوێنی (الانیمیا)، لە ئەنجامیشدا دەبێت بە هۆی کەمبوونەوەی لێهاتوویيو چالاکیی ئەو مرۆڤە.

بەپێی لێکۆڵینەوە زانستییەکان دەرکەوتووە، کە منداڵی وڵاتانی ئەفریقیا لە تەمەنی سێ ساڵیدا، لە هاوتەمەنەکانیان لە وڵاتانی ئەوروپا لەدواترن، لە لایەنی فکریو جەستەییەوە.

٤. گەشەپێدانی هەمەلایەنو تەندرووست، مەرجی سەرەکییە بۆ کەمکردنەوەی ڕێژەی بێکاری. تا کار گەیشتووەتە ئەوەی یەکێك لە زانایان، پێشبینی دەکات (لەو نەوانەی لە داهاتوودا لەدایك دەبنو دەژینو دەمرن، بێئەوەی کارێکی شیاو بدۆزنەوە).

تێکڕای بێکاری، لە نەوەدەکان لە پاکستاندا، ١٩٪ بووە، لە ئەندەنووسیاش، ٥٠٪ بووە.

گرفتی بێکاری، تەنهائەوە نییە، کە مرۆڤ سەرچاوەی بژێوی ون بکات، بەڵکو کاریگەریی سایکۆلوژیو کۆمەڵایەتی ترسناکی، لێ دێتە ئاراوە، کە پێشبینی ئالوودەبوون بە مادە هۆشبەرەکانو چەندان شتی خراپی تری لێ دەکرێت.

گرفتێکی تری وڵاتانی عەرەبیو ئیسلامی، نەبوونی داتاو زانیاریی پێویستە، لە کاتێکدا لە وڵاتانی پێشکەوتوودا، بەئاسانی دەتوانیت ڕێژەی بێکاری بزانیت؛ لە ڕێگای ئەو هاوکارییەی، کە حکومەت دابەشی دەکات، بەسەر بێکارەکاندا.

ئەوەی پێش ناکەوێت لە جێگاکەی خۆی نامێنێتەوە، بەڵکو بۆ دواوە دەگەڕێتەوەو ئەوەشی هەیەتی لەدەستی دەداتو ئەو جیاوازییانە زیاتر دەردەکەونو فراوانتر دەبن، تا هۆکارەکانی زانستو تەکنولۆجیا زۆرتر ببێت.

کاتێك مرۆڤ نەخوێندەوار بێت لەناو نەخوێندەواراندا، یان هەژار بێت لەناو هەژاراندا، ئەمە گرفتێکی ئاسانە، بەڵام ئەگەر نەخوێندەوار بێت لەناو ناوەندێکی خوێندەواریی ڕاهێنراودا، یان شێواو نارێك بێت، لەناو ناوەندێکی ڕێکخراودا، ئەو کاتە هەمیشە ئامادەیە؛ بۆئەوەی بەخراپترین شێوە، ئیستغلال بکرێت، کە ئەمە گرفتی سەرەکیی ئەمڕۆی ئێمەیە.



# سپاردنی دەسەڵات..

وەهاب حەسیب محەمەد

**هونەری سپاردنی دەسەڵات بەراورد بە زانستەکانی دیکە:**

کارگێڕی وەك زانست درەنگ دەرکەوتووە، بێگومان ڕادەستکردنی دەسەڵاتیش کاتێکی زیاتری گەرەك بووە، چونکە زۆربەی کات وردەکارییەکانی بەڕێوەبردن دەرئەنجامی پێداویستییەکانو کەموکورییەکان دەرکەوتوونو بوون بە پێداویستی، کە سپاردنی دەسەڵات یەکێکە لەو ئەرکانە. ڕادەستکردنی دەسەڵات چییە؟ کارێکە بەڕێوەبەر بەشێك لە ئەرکەکانی ڕادەستی کەسێك، یان کەسانێکی دیکە دەکات، بە هیوای تەواوکردنی کارەکە. لێرەدا پێویستە هەڵوێستەیەك بکەین، چونکە هیچ بەڕێوەبەرێك ئامادە نییە بەرپرسیارێتی ڕادەستی کەسانیتر بکات، بەڵام ئەوەی سپاردەی دەکات بەشێکە لە ئەرکو چالاکییەکان. لەم دۆخەدا لە غیابی بەڕێوەبەردا (بەهەر هۆکارێك شوێنکارەکەی جێهێشتبێت)، یاخود لە حوزوری بەڕێوەبەرداو بە هیوای زووتر ڕاپەڕاندنی کارەکانو سوودوەرگرتن لە توانای هاوکارانو کاتی بەردەست، وەها کارێك دەکات.

**بنەماکانی سپاردنی ئەرکەکان:**

١- بەڕێوەبەر بەرپرسیاری یەکەمو کۆتاییە، لە تەواوکردنی کارەکاندا.

٢- پێویستە گشت ئەو ئەرکانە، یاخود ئەو کارانەی ڕادەستی کەسانیتر دەکرێن، تێیان بگەین، یاخود بزانین چین؟

٣- هەڵسەنگاندنو خەملاندنی خاڵی لاوازو بەهێزی، ئەو کەسانەی ئەرکێکیان پێ دەسپێردرێت.

٤. ئامادەکردنو ڕاهێنانی ئەو کەسانەی ئەرکێکیان ڕادەست دەکرێت، تا لە تواناو ئەزموونیان کەڵك وەربگیردرێت.

٥. باوەڕت بەو کەسانە هەبێت کە کارێکیان ڕادەست دەکەیت، هاوکات ڕێزیان بگرە.

٦. دیاریکردنی ئاستی باشیو تەواوکردنی کارەکان، بوارێکیش بۆ هەڵەکردن بهێڵدرێتەوە.

٧. گونجاندن لەگەڵ ئەو بیرۆکانەی بۆ تەواوکردنی کارو بەرەوپێشبردنی دەخرێنە ڕوو، پێداگرو پەرگیر مەبە.

**هەنگاوەکانی سپاردنی دەسەڵات:**

١. وردەکاری لە پێدانی ئەرك، یان ئەرکەکاندا، واتە جەختکردنەوە سەرئەنجامی کارەکە نەك کەسەکان.

٢. پێداچوونەوە بەو کارانەی سپاردەی کەسانیترت کردووە، دارشتنەوەی ئەنجامی داواکراو.

٣. کاتێك بۆ تەواوکردنی کارەکە، یاخود ئەرکەکان.

٤. دیاریکردنی کات، یان کاتی چاودێریو پێداچوونەوەو هەڵسەنگاندنی ئەنجامەکان.

**سوودەکانی سپاردنی دەسەڵات:**

١- پاشەکەوتکردنی کاتو سامان، جەختکردنەوە لەسەر ئەرکە گرنگەکان، یاخود گرنگترینیان.

٢. درووستکردنی توانا، یان توانا بەخشین بە بەردەستان، بە شێوەیەکی کرداری (عملی) لە فێربوونو ڕاهێناندا.

٣. دەرئەنجامی سپاردنی ئەرکەکان، لە تەواوکردنی کارەکاندا جێگرەوەی جیاواز درووستدەکەن.

٤. بەدیهێنانی ئەنجامی زۆرو ئاشکرا.

**ئەو ئەرکانەی پێویستە ڕادەست نەکرێن:**

١. ئەرکە گرنگو هەستیارەکان.

٢. ئەو کارانەی پێویستە خۆت تەواویان بکەیت، یان شوێنیان بکەویت.

٣. ئەو ئەرکانەی پەیوەستن بە نهێنی کەسانیترەوە.

ئەو کەسانەی پێویستە لە شوێنکارەکانیان بهێڵدرێنەوە، یان بەرپرسیارێتی دیکەیان ڕادەست نەکرێت:

١. کەسە پسپۆڕەکان.

٢. ئەو کەسانەی چالاکییەکی دیاریکراویان نییە.

٣. ئەو کەسانەی شارەزانین.

٤. ئەو کەسانەی ناتوانن ئەو کارە ڕاپەڕێنن، کە ڕادەستیان دەکرێت.

٥. ئەو کەسانەی پەیوەست نین بە کاتو وادەی کارکردنەوە.

و: محەممەد مێرگەیی

# زیرەکی باڵندەیەک!

جارێکیان ڕاوچییەک، «کڵاوکوڕەیەکی»* ڕاوکردبوو، لەو کاتەی کڵاوکوڕەکەی بەدەستەوە بوو، کڵاوکوڕەکە بە کابرای ڕاوچی گوت: دەتەوێت چیم لێبکەیت؟

ڕاوچییەکە پێی گوت: دەتکوژمەوەو دەتخۆم!

کڵاوکوڕەکە گوتی: من نەدەبمە شیفاو چارەسەری نەخۆشیو نە دەبمە هۆی تێربوونو ڕزگاربوونت لە برسێتی، بەڵام من تۆ فێری سێ شت دەکەم، کە بۆ تۆ باشترن لەوەی من بخۆیت!

ڕاوچییەکە گوتی: باشە بڵێ بزانم، ئەو سێ شتە چین، کە تۆ فێرم دەکەیت؟

کڵاوکوڕەکە گوتی: ئەوەی یەکەمیان کە دەمەوێت فێرت بکەم، ئەو کاتە دەبێت کە هێشتا لەناو دەستی تۆدام.

ئەوەی دووەمیشیان، ئەو کاتە دەبێت کە بەرم بدەیتو بگەمە سەر لقی درەختەکە، ئەوەی سێیەمیشیان ئەو کاتە دەبێت کە دەفڕمو دەگەمە سەر شاخەکە!

ڕاوچییەکە گوتی: ئێستا ئەوەی یەکەمم پێبڵێ.

باڵندەکە گوتی: ئاخو حەسرەت بۆ شتێك مەخۆ، کە لەدەستت چووبێت!

پاشان ڕاوچییەکە کڵاوکوڕەکەی ئازاد کرد، ئەویش هەڵفڕیو لەسەر درەختەکە نیشتەوە، ڕاوچییەکە پێی گوت: ئێستا ئەوەی دووەمم پێ بڵێ؟

کڵاوکوڕەکە پێی گوت: باوەڕ مەکە بەوەی شتێك ڕووبداتو ببێت، کە نابێت ببێت، یان ئاستەمە ببێت... ئەی بەدبەخت! ئەگەر منت بکوشتبایەتەوە، ئەوا لە ناوسکمدا دوو مرواریت دەردەهێنا، کە هەر یەکێکیان زیاتر لە بیست مسقاڵ دەبوو.

ڕاوچییەکە کە گوێی لەو قسەیە بوو، لێوەکانی خۆی گەستو ئاخو حەسرەتی هەڵکێشا.

باڵندەکە زیاتر هەڵفڕی، تا گەیشتە سەر شاخەکە، ئنجا ڕاوچییەکە بە دەنگی بەرز هاواری کردو گوتی: ئێستا ئەوەی سێیەمم پێبڵێ.

کڵاوکوڕەکە بە هەڵسوکەوتی کابرای ڕاوچی پێکەنیو پێی گوت: تۆ یەکەمو دووەمت لەبیرکرد، ئیدی چۆن سێیەمت پێبڵێم؟

پاشان باڵندەکە گوتی: ئەی پێم نەگوتی: ئاخو حەسرەت بۆ شتێك مەخۆ کە لەدەستت چووبێت، هەروەها باوەڕ مەکە بەوەی شتێك ببێت، کە نابێت ببێت، یاخود ئاستەمە ببێت.

ئەی گەمژە! منو تووکەکانمو گۆشتەکەشم، نابینە بیست مسقاڵ.

کڵاوکوڕەکە ئەم قسانەی کردو لێیدا ڕۆیشت، تا بە تەواوی ڕاوچییەکەی لێ دیارنەما...

* کڵاوکوڕە: باڵندەیەکی بچکۆلەیەو هێندەی چۆلەکەیەك دەبێت، کڵاوێکی لە پەڕ بەسەرەوەیە. ڕەنگی ڕەشو سپیو خەتخەتە، جووڕەپۆپنەشی پێدەگوترێ (Lark).

سەرچاوە: گۆڤاری (العربی الصغیر) ژمارە ٢٦٩ — ٢٠١٥



# ڕۆڵو کاریگەری خوێندنی زانکۆیی، لە پێگەیاندنو ئامادەکردنی کەسانی پسپۆڕ بۆ بازاڕی کار

م: بڕوا محمد دلێر / مامۆستای یاریدەدەرلە زانکۆی سلێمانی- فاکەڵتی ئەندازیاری- بەشی شارستانی

زانکۆ ئەو دامەزراوە ئەکادیمیەیە، کە یەکێك لە ئامانجە سەرەکییەکانی بریتیە لە پێگەیاندنو ئامادەکردنی نەوەیەکی پڕچەککراو بە نوێترین زانستو زانیاریو تەکنەلۆژیای سەردەم، بەشێوەیەك کە لەدوای بەدەستهێنانی بڕوانامەی زانکۆیی، هەر یەکەو لە بواری پسپۆڕی خۆیدا ئامادەباشبێت بۆ هەنگاونانو گرتنەدەستی بەرپرسیاریەتی لە کۆمەڵگادا.

ئەوەی ئێستا بووەتە جێگای تێڕامانو پرسیاری بەشێکی زۆری خوێندکارانی زانکۆکان، ئەوەیە کە ئاخۆ زانکۆ دوا قۆناغی خوێندنو گەڕانە بەدوای زانستو زانیاری؟ مەرجە ئەوەی کە لە زانکۆ بڕوانامە لە پسپۆڕییەکی دیاریکراودا بەدەست دەهێنێت، تێیدا تەواو شارەزابێت؟ هەروەها کەم نین ئەو خوێندکارانەی کە دەپرسن خۆ چوار، یان پێنج ساڵی خوێندنمان تەواو کرد، کەچی هەست ناکەین کە بتوانین لە بواری پسپۆڕیماندا کاربکەین، «خوێندکارانی ئەندازیاری بە نموونە»؟! ئەمەو چەندین پرسیاری تر کە لە لای خوێندکاران درووستبوونو دەبن، کە گومان لەوەدانییە هۆکاری درووستبوونیان لە ئەنجامی تێنەگەیشتن، یان بە هەڵە تێگەیشتن لە ڕۆڵو ئەرکە سەرەکییەکانی خوێندنی زانکۆییو کارنەکردن پێیان سەرچاوە دەگرێت.

مەبەست لەم نووسینە خستنەڕووی پێناسەو ئامانجی سەرەکی خوێندنی زانکۆییو کاریگەرییەتی لە پێگەیاندنو شێوازی ئامادەکردنی نەوەیەکی ئاشنا بە زانستو زانیاری، ئامادەسازو کارا لە بەجێگەیاندنی ئەرکی پێسپێردراو لە بازاڕی کاردا. لەگەڵ تیشکخستنە سەر ئەو هەنگاوانەی کە پێویستە لەلایەن مامۆستایانو بەرپرسانی زانکۆوە، هاوشانی کەسانی پسپۆڕ لەم بوارەدا بنرێن، بە ئامانجی:

١- ڕەواندنەوەو ڕزگارکردنی زانکۆکانی کوردستان لەو بێ متمانەییەی کە لەلایەن خوێندکارانو تەنانەت بەشێکی بەرچاوی ڕۆشنبیرانیشەوە ڕووی تێکردووە.

٢- هەوڵدان بۆ گەیاندنی زانکۆکانی کوردستان بە ئاست زانکۆ باوەڕ پێکراوە جیهانییەکان.

سەبارەت بە ژیانی ئەکادیمیو خوێندنی زانکۆیی، دەتوانرێت بگوترێت کە زانکۆ ئەو دامەزراوە زانستیەیە کە دەبێت ئامانجی پێگەیاندنو ئامادەکردنی نەوەیەك بێت، کە قۆناغە سەرەکییەکانی مەعریفەی بڕیبێت، بەشێوەیەك لەپاش تەواوکردنی ساڵانی خوێندن، ئامادەباش بن بۆ وەرگرتنی ڕۆڵی خۆیان لە بواری پسپۆڕییاندا، بەجۆرێك کە لە زانکۆدا فێرکرابنو ڕاهێنرابن کە چۆن ئەو زانیارییە سەرەکیانەی کە وەریانگرتووە، بکەن بە هەوێنی تێگەیشتنو بەرهەمهێنانی زانستو زانیاری نوێ. هەروەها بۆ هەرگرفتو پرسیارێك کە لە ژیانی ڕۆژانەی کاریاندا بەرۆکیان دەگرێت، بتوانن وەڵامیان بۆی هەبێت، یان لانیکەم هێندە فێرکرابن کە بتوانن وەڵامو چارەسەری گونجاوی بۆ بدۆزنەوە. کەواتە زانکۆ قۆناغی کۆتایی بەرهەمهێنانو بەخشینی بڕوانامەی پسپۆڕیو پیشەیی نییە، هێندەی ئەوەی کۆتایی قۆناغی یەکەمی بەرهەمهێنانو بەخشینی بڕوانامەی ئامادەسازی

خوێندکارانە بۆ کردنەوەی «دەرگای یەکەمی» چوونە ناو ژیانی پیشەییان؛ بەشێوەیەك کە ئیتر ئەوان فێرکراو ڕاهێنراون کە پشت بەخۆیان ببەستن لە شیکردنەوەو بڕیاردان، یاخود بتوانن بە ئاسانی لە کەسانی بە ئەزموون زانیاری وەربگرن‌و پراکتیزەی بکەن.

گومان لەوەدا نییە، گەر بەو شێوەیە لە خوێندنی زانکۆیی‌و ئەرکە سەرەکییەکانی تێبگەین‌و کار بۆ چەسپاندنی بکەین، ئەوا دەتوانین ڕۆڵی گرنگ‌و پڕ بایەخی زانکۆ بۆ سەرجەم کایەکانی ژیان بگەڕێنینەوەو زانکۆکانی خۆمان بگەیەنینە ئاست زانکۆ جیهانییە باوەڕپێکراوەکان، ئەگەر چی توانا مرۆیی‌و زانستییەکانی ئێمە بە بەراورد بەوان هیچی کەمتر نییە! هەروەها زانکۆکانیشمان لەو بێ متمانەییەی کە لەلایەن خوێندکاران‌و ڕۆشنبیرانەوە ڕووی تێکردووە، ڕزگار بکەین.

ئێستا پرسیاری سەرەکی ئەوەیە، کە ئاخۆ چۆن بتوانرێت ئەوەی باسکرا بچەسپێنرێت‌و پەیڕەوبکرێت؟

بۆ وەڵامی ئەم پرسیارە وا پێویست دەکات ئەو چەند خاڵەی لە خوارەوەدا ئاماژەی پێدراوە، لەلایەن مامۆستایان‌و بەرپرسانی زانکۆ، هاوشانی کەسانی پسپۆڕ، هەریەکەو بەپێی قەبارەی بەرپرسیارێتی، لە هەوڵی چەسپاندن‌و پەیڕەوکردنیدا بن:-

**١- سەبارەت بە خوێندکاران:**

* لەسەرەتای هاتن‌و دەستپێکردنی خوێندنی زانکۆییاندا، گرنگە خوێندکارەکان ئاشنابکرێن بە پێناسەو فەلسەفەو ئامانجی سەرەکی لە بوونی خوێندنی زانکۆییدا. بەمەش خوێندکار هەرزوو تێدەگات کە زانکۆ پێویستە چی پێببەخشێت‌و ئەویش لەبەرامبەر ئەوەدا، دەبێت چ بەرپرسیارێتییەك هەڵبگرێت.

* دەبێت خوێندکار تێبگەیەنرێت کە لەگەڵ هاتنی بۆ زانکۆ قۆناغی لەبەرکردن «ئەگەر هەبوو بێت لە پێشاندا»، بەسەردەچێت‌و قۆناغی تێگەیشتن‌و بیری ڕەخنەگرانە جێگایان دەگرێتەوە. بەمەش خوێندکارانی چالاك‌و بەرهەمهێن لە بوارەجیاجیاکانی پسپۆڕییاندا سەرهەڵدەدەن کە بە هەموو بابەت‌و باسێك هەروا بەئاسانی ناڵێن درووستە، بەڵکو ئیتر گفتوگۆو بیروڕای زانستی چڕو گەشە دەکەن. ئیدی خوێندکار هەر گوێگرو مامۆستاش هەر قسەکەر نابێت، وەك ئەوەی یەکێکیان لە دۆڵێکداو ئەویتریان لەسەر چیایەك، کە هیچ لێکتێگەیشتنێك لە نێوانیاندا نەبێت! بەڵکو پەیوەندییەکی زانستی درووست، پێویستە هەمیشە بوونی هەبێت، کە هەر ئەمەش دەبێتە سەرچاوەو ڕێڕەوی داهێنان‌و پەرەسەندن لە کایەی زانستیدا.

* خوێندکار دەبێت ئاگادارو ڕابهێنرێت لەسەر ئەوەی، هەر ئەرك‌و کارێکی زانستی پێدەدرێت، ئامانج لێی تەنها دەرچوون‌و بەدەستهێنانی نمرە نییە، هێندەی ئەوەی کە بەدەستهێنانی نمرەی سەرکەوتن ئامرازێکە بۆ هاندانی خوێندکاران، بۆ تێگەیشتن‌و داهێنانی زانستی، یان لانیکەم بۆ زیادکردنی ئاستی مەعریفی خوێندکارەکانە هەریەکەو لە بواری پسپۆڕی خۆیدا.

* زۆر گرنگە کە خوێندکاران فێربکرێن‌و هانبدرێن‌و ڕابهێنرێن، لەسەر پێشکەشکردن‌و بەشداریکردن لە سیمیناری زانستی‌و شێوازی دەستپێکردنی نووسینی ڕاپۆرتی تاقیگەیی‌و زانستی هەمەجۆر، بەشێوەیەك کە ئیترلە کۆپیکردنی بابەتی کەسانی تر دەربچن‌و بنەماسەرەکییەکانی دارشتنی سیمینارو نووسینی ڕاپۆرت بەپێی پێوەرە جیهانییەکان پەیڕەو بکەن. بەمەش دەتوانین خوێندکارێکی چالاك کە بەردەوام تامەزرۆی بەدەستهێنانی زانست‌و وەڵامی گونجاو بێت، بۆ پرسیارە درووستبووەکان بەرهەمبهێنین. خوێندکارێك کە بڕوای بەخۆی هەبێت‌و لەسەرپێیەکانی خۆی بەپێتەوی ڕابووەستێت‌و تێبگات کۆپی، یان دزینی بەرهەمی زانستی، کەسانێکی تر هیچ سوودێکی پێناگەیەنێت، جگە لە بێڕێزی نەبێت، بەخاوەنەکانیان‌و زیادنەکردنی هیچ زانیارییەك بۆ هەگبەی زانستی خۆی.

* زۆر گرنگە بۆ سەردەمی ئێستای ژیانی مرۆڤایەتی کە بەسەردەمی جیهانگیری ناوزەند دەکرێت، بۆ پێگەیاندنی ئاستی مەعریفی خوێندکاران، تەنها پشت بە توانای مرۆیی‌و زانستی مامۆستایان نەبەسترێت. بەڵکو زۆر گرنگە کە زانکۆ لە پەیوەندی بەردەوامدا بێت لەگەڵ کۆمپانیا سەرکەوتووەکان‌و کەسانی خاوەن ئەزموون «تەنانەت ئەگەرخاوەن بڕوانامەش نەبن»! بۆئەوەی هەمووان پێکەوە بتوانین هاوکاربین، لەگەیاندنی ئەزموون‌و نوێترین زانیاری‌و تەکنەلۆژیایی داهێنراو، بە خوێندکاران.

**٢- سەبارەت بە مامۆستایان‌و بەرپرسان لە کاروباری زانکۆدا:**

* هەوڵدان بۆ فەراهەمکردنی سەرجەم پێداویستی‌و هۆکارە سەرەکییەکانی وانەوتنەوە، کە گونجاوو شیاوبێت بە ئێستای ئاستی زانستی‌و پەرەسەندنەکانی بواری تەکنەلۆژیا.

* هەوڵدان بۆ دابینکردنی کەلوپەلی پێویست بۆ تاقیگەکان، کە گونجاوو شیاوبێت لەگەڵ بەرەوپێشچوونەکانی سەردەمدا لە سەرجەم فاکەڵتیەکان بەشێوەیەك کە مامۆستایان بە ئاسانی بتوانن تێیاندا تاقیکردنەوەو توێژینەوەکانیان بەبەرهەم بگەیەنن. ئەمەش سەرەتا بە دانان‌و کردنەوەی خولی بەردەوام بۆ کەسانی پسپۆڕ تێیاندا دەست پێدەکات.

* هەوڵدان بۆ کردنەوەی خوولی ڕاهێنان‌و فێرکردنی بەردەوام بۆ مامۆستایان بەگشتی‌و مامۆستایانی یاریدەدەر بەتایبەتی، کە نوێن لەبواری وانەوتنەوەدا، لە ناوەوەو دەرەوەی وڵات؛ بۆئەوەی هەمیشە بەئاگابن لە تازەترین داهێنان‌و توێژینەوەی زانستی، هەریەکەو لە پسپۆڕی خۆیدا.

* هەوڵدان بۆ درووستکردنی تیمی زانستی بەشێوەیەك هەر مامۆستایەکی هەڵگری نازناوی زانستی پرۆفیسۆر، یان پرۆفیسۆری یاریدەدەر، دوو تا پێنج مامۆستای یاریدەدەر لە هەمان پسپۆڕییاندا لە خۆبگرێت؛ بۆئەوەی پێکەوە بتوانن برەو بەتوێژینەوەو ئاڵوگۆڕی بیروڕای ئەکادیمی‌و زانستی بدەن.

لە کۆتاییدا ئەوەی ماوە کە پێویستە بگوترێت، ئەوەیە کە هەمووومان بە مامۆستاو خوێندکارەوە، دەبێت گەشبینانە بڕوانینە داهاتوو، بەرپرسیارانە مامەڵە بکەین بەرامبەر بەم قۆناغەو هەرچی لە تواناماندا هەیە بیخەینەگەڕ؛ بۆئەوەی ئامرازو هۆکار گەلێکی ئەرێنی بین، لە دارشتنی پلان‌و بناغەی پتەویی زانستیی، بۆنەوەی نوێ‌و قۆناغی داهاتوو.

# زاراوەکانی بازرگانیی نێودەوڵەتی

ئا/ محەممەد هاشم محەممەد / بەشی یەکەم

زاراوەکانی بازرگانیی نێودەوڵەتی «مصطلحات التجارة الدولية».«INCOTERMS»یان پێی دەوترێت: مەرجەکانی تەسلیمکردن «شروط التسليم«Delivery Terms»»..

ئەم ناونیشانە لەوانەیە بەلای زۆربەی خەڵکییەوە، هەندێك نامۆ بێت، بەڵام ئەوانەی لە بواری بازرگانیی نێودەوڵەتیدا کار دەکەنو کاری هاوردەو هەناردن «الاستيراد والتصدير» دەکەن، دەزانن ئەم بابەتە زۆر گرنگە؛ بۆئەوەی بتوانن بە شێوەیەکی ڕاستو درووستو بێکیشە، بازرگانیی نێودەوڵەتی بکەن.

زاراوەکانی بازرگانیی نێودەوڵەتی «INCOTERMS»:بریتییە لە چەند زاراوەیەك، کە لە «ژووری بازرگانیی نێودەوڵەتيي»ەوە، دەرچووە، ئەم زاراوانە بەکاردێن بۆ ناوخۆو دەرەوەی هەر وڵاتێك، کە کرداری بازرگانی «کڕینو فرۆشتن»، یان «استيراد وتصدير»ی تێدا ئەنجام بدرێت، لە لایەن هەموو وڵاتانی جیهانەوە، جێگای باوەڕەو ڕێکخراوە بە یاسایەکی تایبەتی خۆیو ناتوانرێت پشتگوێ بخرێت، لە کاتی کڕینو فرۆشتنی هەرشتێك لە ناوەوەو دەرەوەی وڵاتدا.

## مێژووی بازرگانیی نێودەوڵەتی:«INCOTERMS»

سەرەتا لە ساڵی ١٩٣٦ لە «ژووری بازرگانیی نێودەوڵەتی ICC - لە پاریس» دەرچووەو «١٠» ساڵ جارێك، چاوخشاندنەوەو بەدواداچوونی بۆ دەکرێتو تا ئێستا «٨» جار ڕیڤایس کراوەتەوە، بۆیە دواجاری لە ساڵی «٢٠١٠» دەرچووەو لەبەردەستماندایەو تائێستا ئیشی پێ دەکرێتو مەرج نییە «١٠» ساڵ جارێك دەربچێتەوەو جێگیر بێت، بەڵکو ئەگەر پێویست بکاتو هەست بکەن، کە کێشەی گەورە هەیە لەم بوارەدا، ئەوا کەمتر لەو ماوەیە ڤێرژنی تازەی دەردەچێتو هەموو ئەو کێشانە چارەسەر دەکات، کە هەیەو ڕێنمایی تازەی بۆ دەردەکرێت لە لایەن «ژووری بازرگانیی نێودەوڵەتی ICC».

درووستبوونو هاتنە کایەی ئەم برگەو زاراوانە، لە ئەنجامی ئەو پەیوەندیو پێویستییانەی کە لە نێوان بازرگانەکاندا ڕوو دەدات، مەبەستمان بە بازرگان «کڕیارو فرۆشیار -البائع والمشتريBuyer – & Seller» «هاوردەو هەناردن -الاستيراد والتصديرImporter – & Exporter».

مەرجەکانی ڕادەستکردن: «شروط التسليم Delivery Terms» لە بازرگانیی نێودەوڵەتیدا: بە گرنگترین برگە دادەنرێن، کە لە هەموو گرێبەستێکی «کڕینو فرۆشتن»دا، بوونیان هەیە لە نێوان «کڕیارو فرۆشیار» لە کاتی ڕێککەوتنو کردنەوەی- Letter of Credit» «L/C الاعتماد المستندي» واتە: پشتبەستن بە نووسراوی بانکی، کە تێیدا دیاریکردنو وردەکاریو چۆنێتیی مامەڵەکردنو پەیوەندیی نێوان «کڕیارو فرۆشیار» دەخاتە ڕوو؛ لەبارەی بە کرداری ئاڵو گۆڕینەوەی کاڵاو کەرەستەکان «تبادل البضائع «GOODS» «لە دوو بواری زۆر گرنگدا»:

١- نرخو تێچووی کاڵاو کەرەستەکان لە:

أ. نرخی ڕاستەقینەی کەرەستەکان.

ب. هەر تێچوویەکی تر هەبێتو بخرێتە سەر نرخی ڕاستەقینەی کاڵاو کەرەستەکان، لە گواستنەوەو بارکردنو هێنانە خوارەوەو دڵنیابوونو ...هتد.

٢- بەرپرسیارێتی «Responsibility المسؤولية»: ئەو کەرەستانە، واتە: کەی بەرپرسیارێتیی کەرەستەکان دەگوازرێتەوە لە فرۆشیارەوە بۆ کڕیار، ئەو خاڵەی کە هەردووکیان ڕێك کەوتوون لەسەریو کۆتا شوێنە، کە کرداری پێدانو وەرگرتنی مەوادەکانی تێدا ئەنجام بدرێت، چونکە پێویست دەکات هەر یەکێکیان «کڕیارو فرۆشیار» بزانن تا ئەو خاڵەی کە دیاری کراوە «نقطة تسليم البضاعة» تێچوو دەبێت بە چەند؟ مەسرەفەکان چەندن؟ بەرپرسیارێتیی کامیان کۆتایی پێدێتو بەرپرسیارێتی ئەوی تر دەست پێ دەکات؟

چونکە ئێمە لێرە، کە سێکمان هەیە «کڕیار»، کە پارەی پێیەو کەسێکی تریشمان هەیە «فرۆشیار»، کە کەرەستەو کاڵای هەیە، لە کرداری بازرگانی «کڕینو فرۆشتن» شتەکان ئاڵو گۆڕی پێ دەکرێت، واتە: پارەکە دەچێتە لای فرۆشیارەکەو کەرەستەو کاڵاکانیش دەچنە لای کڕیارەکە.

بۆیە لێرە زۆر گرنگە بۆ هەردوو لا «کڕیارو فرۆشیار»، بەڵام بۆ کڕیارەکە زیاتر گرنگە، کە بزانێت:

یەکەم: تێچووی کەرەستەکان بەگشتی چەندە؟

دووەم: چ کاتێك، یان لە چ خاڵێك بەرپرسیارێتی فرۆشیار دەگوازرێتەوە بۆ کڕیار؟

«INCOTERM٢٠١٠»، کە دوا ڤێرژنەو تا ئێستا ئیشی پێ دەکرێت لە «١١» زاراوە پێکدێتو لەسەرەتای ساڵی «٢٠١١» یەکەم بەکارهێنانی بوو، وێنەی سۆفت کۆپیو هاردکۆپی هەیەو دابین کراوە لە «١٠٠» ژووری بازرگانی جیهانی لە گشت وڵاتەکان.

ئەم زاراوەو مەرجانەی کە دانراوە، پەیوەندی بە سیاسەتەوە نییە، یاسا نییەو هیچ یاسایەك پابەندت ناکات بە بەکارهێنانیان، بەڵکو کۆمەڵێك ڕێنماییە، بازرگانەکان دەتوانن بەکاری بهێننو بگەڕێنەوە سەری بۆ ڕێکخستنی کرداری «کڕینو فرۆشتن»ەکانیانو کۆنترۆڵکردنی نرخو شێوازی گواستنەوەو خاڵی تەسلیمکردنو دیاریکردنی بەرپرسیارێتی کڕیارو فرۆشیار.

لێرەوە ئەو نووسراوەی کە دەرچووە، لە «ژووری بازرگانیی نێودەوڵەتی– International Chamber of Commerce» « «ICCلە ساڵی ٢٠١٠ لە پاریس، زاراوەکانی بازرگانیی «شروط التسليم»ی دابەش کردووە بەسەر «٢» دوو گرووپەوە، کە لە «١١» زاراوە پێکدێت.

**گرووپی یەکەمی زاراوەکان:** تایبەتن بە شێوازی گواستنەوەی مەوادو کەرەستەو کاڵاکان، لە ڕێگای دەریاو ڕێگای ئاوییە ناوخۆییەکان، ئەمانەش پێکدێن لە «٤» زاراوە:

«FAS ،CFR ،CIF ،FOB».

**گرووپی دووەمی زاراوەکان:** تایبەتن بە گشت شێوازەکانی گواستنەوە، لە ڕێگای هەموو شێوازەکانی گواستنەوەی «دەریا، ئاسمان، وشکانی» ئەوانیش پێکدێن لە «٧» زاراوە

«DDP،DAP،DAT،CIP، CPT، FCA،EX-WORK»، کە لە بەشەکانی داهاتوودا باسیان لێوە دەکەین.






# شەکرە
# Diabetes Mellitus

١. بڵاوبوونەوەی نەخۆشیی شەکرە:

نەخۆشیی شەکرە، بە یەکێك لە نەخۆشییە بڵاوو درێژخایەنەکان دادەنرێت، بەشێوەیەك زیاد لە (٢٤٠ ملیۆن) تووشبوو لە جیهاندا هەیە، پێشبینیش دەکرێت، بە هاتنی ساڵی (٢٠٢٥)، ژمارەکەیان بۆ (٣٣٠ ملیۆن) تووشبوو زیاد بکات، ئەم رێژەیە، (٨٠٪)یان لەو وڵاتانە دەژین، کە پێیان دەوترێت: وڵاتانی جیهانی سێیەم، کێشەکە لەوەدایە؛ لە (٥٠٪)یان نازانن تووشی نەخۆشیی شەکرە بوون، لە هەندێك وڵاتدا، گەیشتووەتە لە (٨٠٪). هۆکاری زیادبوونی رێژەی تووشبوون، دەگەرێتەوە بۆ گۆرانی شێوازی ژیانی سەردەمییانەو شارستانییانە، کە لەگەڵ خۆیاندا، قەڵەویو کەم جووڵانو گۆرانی خواردنیان، بە دیاری لەگەڵ خۆیاندا هێناوە. ئەوەی جێگای نیگەرانییە، هەردوو جۆرەکەی شەکرە، لەناو هەرزەکارانو لاواندا، رێژەکەیان بەشێوەیەکی مەترسیدار زیادی کردووە. ئەم رێژەیە، لە وڵاتانی کەنداودا، زۆر زیادی کردووە، لە یەکێك لە وڵاتانی کەنداودا، رێژەی تووشبووانی ئەوانەی تەمەنیان لە نێوان (٣٠-٧٠) دایە گەیشتووەتە (٢٤٪)... هەر ئەمەش نا، بەڵکو رێژەی ئەو هەرزەکارانەی پشکنینیان بۆکراوەو ئەگەری تووشبوونیان هەیە، گەیشتووەتە لە (١٦٪).

٢. جۆرەکانی شەکرە:

پەنکریاس، ئەو ئەندامەی لەشە، کە هۆرمۆنی ئەنسۆلین دەردەدات. ئەم هۆرمۆنە، بەرپرسە لە رێکخستنی بری شەکر لە خوێندا. بەشێوەیەکی بنچینەیی، شەکرە دوو جۆری هەیە:

- جۆری یەکەم: زیاتر منداڵانو لاوان دەگرێتەوە، لەم بارەدا پەنکریاس ناتوانێت ئەنسۆلین دەربدات؛ بەهۆی تێکشکانی ئەو خانانەی پەنکریاسەوە، کە ئەنسۆلین دەردەدەن، لە ئەنجامی هێرشی بەرگرییە کۆئەندامەوە.. بۆیە تووشبوو پێویستی بەبەکارهێنانی ئەنسۆلینە.
- جۆری دووەم: زیاتر کەسانی تەمەندار دەگرێتەوە- ئەوانەی سەرو چل ساڵن-(٩٠٪ ی تووشبووان لەم جۆرەن)، شایەنی باسە، قەڵەویو کەم جووڵان، هۆکاری راستەوخۆی ئەم جۆرەن.. لەم بارەدا، پەنکریاس بری تەواوی ئەنسۆلین دروست ناکات، یان بری تەواوی ئەنسۆلین هەیە، بەڵام لەش ناتوانێت سوودی لێوەربگرێت بەهۆی (Insulin resistance )ەوە.

٣. نیشانەکانی تووشبوون بەشەکرە:

- زۆر میزکردن.
- زۆر تینووبوون.
- ماندووبوون.
- دابەزینی کێش.
- زیادبوونی ئارەزووی خواردن.
- درەنگ سارێژبوونی برین، بەتایبەت لە پێیەکاندا.
- لەدەستدانی قاڵبوونەوە (تەرکیز).
- سربوونو مێرووڵەکردنی پەلەکان.
- لێڵبوونی بینین.
- چەند جارە بوونەوەی هەوکردنی رێرەوی میز لە ئافرەتاندا.
- لەهەردوو بارەکەدا، پێویستە ناو بەناو پشکنینی شەکر لە خوێندا بکرێت.

٤. کاریگەرییە نەرێنییەکانی شەکرە:

- رەقبوونی خوێنبەرەکانو پشێویی دڵ.
- تێکچوونی بینین.
- شکستی گورچیلە.
- تێکچوونی دەماری.
- کێشە لە قاچەکاندا، نەخۆشیی گانگرین لە پەلەکانی خوارەوە.

٥. ئەو کارتێکەرانەی رێخۆشکەری نەخۆشیی شەکرەن:

- قەڵەویی، بەتایبەت ئەو جۆرەی بەشی سەرەوەی لەش دەگرێتەوە، لەم بارەدا کێشەکە کەمی ئەنسۆلین نییە، بەڵکو زۆریو گەورەیی قەبارەی خانە چەورییەکانی لەشە، رێگری لە فەرمانی ئەنسۆلین دەکەن، کە پێی دەوترێت: (Insulin Resistance)، لە ئەنجامدا ئەنسۆلینێکی زۆر دەردەدرێت، بەڵام ناتوانن ئەرکی خۆیان بەجێ بهێنن.
- کەم جووڵانو وەرزش نەکردن.
- بوونی شەکرە لە مێژووی خێزاندا.
- چوونە سەری تەمەن.
- بەرزبوونەوەی چەوریی خوێن.
- بوونی هەندێك کارتێکەری بۆماوەیی لەسەر ناوکە ترشی (DNA).

٦. خۆپاراستن لە نەخۆشیی شەکرە:

توێژینەوەکان دەریانخستووە؛ لە دە کەسدا، نۆ کەسیان ئەگەری تووشبوونیان لێدەکرێت بە جۆری دووەم، بەڵام لەم رێیانەوە، دەتوانین خۆمان بپارێزین:

- دابەزاندنی کێش، لە رێی پەیرەوکردنی سیستمێکی خۆراکیی تەندرووستو ئەنجامدانی وەرزش.
- هەر باوكو دایكێك شەکرەیان هەبوو، ئەوا پێویستە زیاتر هانی منداڵەکانیان بدەن، لەوەی خۆراکی زۆر لە لەشیاندا کەڵەکە نەکەنو خۆیان بەدووربگرن لە قەڵەوی.
- هەر دایكێك منداڵێکی قەڵەوی بوو، پێویستە هەر لە منداڵییەوە، بەرەنگاری قەڵەوییەکەی ببێتەوە.

ن: د. حسان شمسی پاشا --------- و: یەحیا محەممەد عەلی

# سوودەکانی مەعدەنووس

مەعدەنووس یەکێکە لەو سەوزانەی دژی زۆرێك لەو نەخۆشییانەیە کە تووشی لەش دەبێت، بە جۆرێك جگەرو ڕیخۆڵەکان لە شێرپەنجە دەپارێزێت، ڕێگە لە درووستبوونی بەردی گورچیلە دەگرێت، بە کوڵاندنو بۆ ناو زەڵاتەش بەشێوەیەکی فراوان بەکاردێت.

مەعدەنووس بڕێکی زۆر ڤیتامین (C) پێویستی، بۆ تەندرووستی چاوو قژو ددانو بەرگری لە پەتاو دژە ئۆکسان تێدایە، هەروەها بڕێك لە کانزاکانی وەك ئاسنو مەنگەنیزو کالیسیۆمو فسفۆری تێدایە.

**بە گشتی مەعدەنووس خاوەنی ئەم سوودانەیە:**

**یەکەم: بۆ دابەزاندنی کێشی لەش:-** لەبەرئەوەی مەعدەنووس سەرچاوەیەکی باشی ڤیتامینەکانی (A، C، K)ە، هەروەها ترشی فولیك لە پێکهاتنیدا هەیە، لەبەرئەوە ئامۆژگاریی بەکارهێنانی دەکرێت، ڕۆژانە بەشێوەی کوڵاو بخورێتەوە، لەگەڵ سینستەمی خۆراکیدا، چونکە وەك کارای یاریدەدەر لە دابەزاندنی کێشی لەش کار دەکاتو یارمەتی میزکردن دەدات، بەباشی ئەوەش دەبێتە هۆی ڕزگارکردنی لەش لە ئاوی زیادە.

**دووەم: سوودی بۆ دڵ:** مەعدەنووس یارمەتی پاراستنی دڵو لوولەکانی خوێن دەدات، کار لە نزمکردنەوەی ڕێژەی کولیسترۆڵی خوێن دەکات، لە ڕێی ئەو ڕیشاڵە زۆرانەی لە پێکهاتنیدا هەیە. پزیشکەکان ئامۆژگاری ئەو کەسانە دەکەن کە نەخۆشی دڵیان هەیە، مەعدەنووس بخۆن، چونکە ترشی فۆلیك یارمەتی گۆڕینی هۆمۆسیستین دەدات، بۆ گەردی بێ زیان، لە کاتێکدا ئەگەر ئاستی هۆمۆسیستین لەناو خوێندا زۆر بوو، زیان بە لوولەکانی خوێن دەگەیەنێت.

**سێیەم: ڕێگە لە ڕووتانەوەی قژ دەگرێت:** لەگەڵ ئەوەی ڤیتامینو کانزاکانی ناو مەعدەنووس، ڕێگری لە ڕووتانەوەی قژ دەگرێت، هەروەها دەتوانرێت قژ بە زەیتی مەعدەنووس چەور بکرێت بۆ پاراستنی قژ، لە هەمان کاتدا دەتوانرێت، بە کوڵاوی بەکاربێت بۆئەوەی بریسکە بە قژ ببەخشێت.

**چوارەم: سوودی بۆ گورچیلە:** یارمەتی خێراکردنی کرداری دەرکردنی ژەهر لە گورچیلەکاندا دەدات، بە هۆی ئەوەی ماددەکانی ئیبۆڵو ماریستیسینی تێدایە، ئەوەش دەبێتە هۆی خاوێنکردنەوەی ڕێڕەوەکانی میز، بەڵام بۆ ژنانی دووگیان نابێت زیادەڕەوی بکەن لە خواردنیدا، چونکە کاردەکات لە زیادکردنی کرژبوونەکانی ڕەحم، ئەوەش دەبێتە هۆی زیادبوونی تێکرایی لێدانەکانی دڵی کۆرپەلە.

**چۆنیەتی درووستکردنی گیراوەی کوڵاوی مەعدەنووس بۆ گورچیلە:** بڕی (٣٠) گم گەڵای مەعدەنووس لە لیترێك ئاوی کوڵاودا، بۆ ماوەی کاتژمێرێك دادەنرێت، دەتوانرێت بۆ ماوەی پێنج ڕۆژ بخورێتەوە.

**پێنجەم: سوودی بۆ پێست:**

لەبەرئەوەی مەعدەنووس ڕێژەیەکی زۆر ڤیتامین (C) دژە ئۆکسانی تێدایە، ڕێگری دەکات لە دەرکەوتنی چرچو لۆچی پێستو گرنگە لە بەرهەمهێنانی کۆلاجین، ڕژێنە چەورییەکان ڕێك دەخات، لە پێناو پاراستنی پێست لە وشکیو یارمەتی خاوێنکردنەوەی دەدات.

**شەشەم: پارێزەرە دژی شێرپەنجە:**

لەبەرئەوەی ماددەی مایرسیتیسینی تێدایە، کە ڕێگری دەکات لە گەشەی وەرەمی شێرپەنجەیی، بەتایبەتی وەرەمی سییەکان کە بەهۆی جگەرە کێشانەوە درووست دەبن.

**حەوتەم: سوودی بۆ کۆڵۆن:** هۆکارێکی باشە بۆ ئاسانکردنی کرداری هەرسکردن، یارمەتی هەرسی چەوریو پرۆتینەکان دەداتو کاری ڕزگارکردنی لەش، لە پاشماوەی خۆراکی خێرا دەکاتو کۆڵۆن خاوێن دەکاتەوە.

**هەشتەم: زۆر بەسوودە بۆ نەخۆشی شەکرە:**

ڕۆڵێکی باش دەبینێت لە نزمکردنەوەی ڕێژەی شەکری خوێن.

**نۆیەم: بۆ چەند مەبەستێکی تر بەکاردێت:** نەهێشتنی بۆنی پیاز، بیرەوەری بەهێز دەکاتو بەرگری دەکات لە لەبیرچوونەوە، بۆنێکی خۆش بە لەش دەبەخشێت لە کاتی جوینی دا، ئازاری سك ناهێڵێتو کرداری هەرس خێرا دەکاتو ئارەزووی خواردن زیاد دەکات، لەش لە ئازارەکانی سنگو کۆکە دەپارێزێ، بۆ کەم خوێنی بەسوودە، چارەسەری ڕژێنی دەرەقی دەکاتو مێشك هێور دەکاتەوە، باڵانسی هۆرمۆنی ناو لەشی ئافرەت دەکاتو سووڕی مانگانە ڕێك دەخات.

بەڵام خواردنی زیاتر لە (٣) جار لە ڕۆژێکدا باش نییە، بەهۆی بوونی ماددەی ئۆکسالات تێیدا، کە چڕبوونەوەی لە ناو لەشدا زیان بە تەندرووستی دەگەیەنێت، بۆ نموونە زیادکردنی کرژبوونی ڕەحم، خوێنبەربوون لە ئافرەتی دووگیاندا.

سەرچاوە: سایتی تێن لاینس



# لێکدانەوەی کەسایەتیت، بەپێی مانگی لەدایکبوونت..

## "مانگی چوار"

بەرای دەروونناسانو توێژەرەوان، ئەو کەسانەی لە مانگی چواردا چاویان بە دونیا هەڵهێناوە، هەروەکو مانگەکانی (یەکو دوو سێ)، کە لە پێشتردا باسمان کرد، خاوەنی کۆمەڵێك سیفاتی ئەرێنیو نەرێنین، لەم ژمارەیەدا سیفاتەکانی ئەو کەسانە باس دەکەین کە لە مانگی چواردا، واتە مانگی نیسان، چاویان بە دونیا هەڵهێناوە، بەو هیوایەی بتوانین سیفاتە ئەرێنییەکانمان تۆکمەترو بەهێزتر بکەینو زیاتر پەرەیان پێبدەین، هەروەها هەوڵ بدەین لە بری سیفاتە نەرێنییەکانمان سیفاتی جوانو ئەرێنی بروێنینو خۆمان لە سیفاتە نەرێنییەکان دارنین..

**سیفاتە ئەرێنییەکانی ئەو کەسانەی لە مانگی (٤)دا، چاویان بە ژیان هەڵهێناوە:**

١- کەسانێکی چالاكو گورجو گۆڵن.

٢- خاوەنی ژیرییەکی بەکارو بیرتیژن.

٣- کەسانێکی دیبلۆماسین.

٤- هەمیشە دڵنەوایی کەسانی دەوروبەریان دەکەن.

٥- حەز بە هاوڕێیەتی دەکەن، هەروەها حەز دەکەن گرفتو کێشەی هاوڕێکانیان چارەسەر بکەن.

٦- کەسانێکی ئازاو جەربەزەو دەستپێشخەرن.

٧- ڕۆح سوكو خۆشەویستو گرنگی بە هاوڕێکانیان دەدەن.

٨- نەرمو نیانو بەخشندەن.

٩- سۆزدارو هەست ناسکن.

١٠- خاوەنی زاکیرەو یادگەیەکی بەهێزو بە توانان.

١١- هەمیشە هانی خۆیانو دەوروبەرەکەیان دەدەن.

**سیفاتە نەرێنییەکانی ئەو کەسانەی کە لە مانگی چواردا لە دایکبوون:**

١- بە ئاسانی تووڕە دەبن، بەڵام دوای تووڕەبوونەکەیان هەست بە پەشیمانی دەکەن.

٢- بە خۆیان سەرسامنو جاروباریش بەزەییان بە خۆیاندا دێتەوە.

٣- حەز بە تۆڵەستاندن دەکەن، واتە زیاتر تۆڵەستێنن وەك لەوەی کەسانێکی لێبوردە بن.

٤- سیفەتی دوژمنایەتیو ڕکابەری بەسەریاندا زاڵە.

٥- لە بڕیارداندا بە پەلەن، هەروەها بۆ بەدەستهێنانی دەستکەوتو هێنانەدی ئاواتەکانیان پەلە دەکەن.

٦- زۆر عاتفین، زۆربەی خەمەکانیان بە گریان دەردەبڕن.

٧- بە ئاسانیو زوو زوو دووچاری نەخۆشی دەبن.. بەتایبەت ئازاری سنگو سەر.

**لەبەرئەوەی ئەم مانگە هاوکاتە لەگەڵ وەرزی بەهاردا، توێژینەوەیەك سەبارەت بەو کەسانە دەخەینەڕوو کە لە وەرزی بەهاردا هاتونەتە دونیاوە:**

توێژینەوەکە لە وڵاتی بەریتانیا ئەنجامدراوەو باس لە کەسایەتیو هەڵسوکەوتی مرۆڤەکان دەکات، بەپێی ئەو وەرزانەی کە تێیدا لە دایکبوون..

**ئەو کەسانەی لە وەرزی بەهاردا لە دایکبوون.**

بەشێوەیەکی گشتی، کەسانێکی گەشبینن بە ژیان، چێژ لە چالاکیو زیندوێتیو کارەکانیان دەبینن، بەڵام لە لایەنی تەندروستییەوە بە دەست نەخۆشی هەستیارییەوە دەناڵێنن.

زۆربەی ئەو کەسانەی لەم وەرزەدا لە دایکبوون، هەست بە جۆرێك بەختەوەریو ئاسوودەیی دەکەن، لەبەرئەوەی وەرزی بەهار جیادەکرێتەوە بە کەشو هەوایەکی گونجاوو لەبار بۆ لەدایکبوون، وەکو هەمیشە کەشو هەوا لە وەرزی بەهاردا گونجاوو لەبارەو بوژێنەرو زیندوکەرەوەیە.

# گەشبین و ڕەشبین

و. لە تورکییەوە: گەشبین حسین

**گەشبین:** لەم دنیایەدا، هیچ شتێك لەوە گرنگتر نییە، کە مرۆڤ هەست بە باشبوونی خۆی بکات.

**ڕەشبین:** ببورە، کەمێك لەمەوپێش بە تۆم نەگوت، کە هەموو شتێك چەندە بێزراوە؟

**گەشبین:** کە هەست بە باشبوونی خۆت دەکەیت لە ناختدا، جووڵە جووڵێك دەبێت. هەر بە هۆی ئەم وروژاندنەوە، چیت بوێت دەتوانیت بەدەستی بهێنیت. هەم ئەوەی، کە دەتەوێت، هەم هەموو ئەو شتانەی، کە خۆشت دەوێت، دەبێت بە هی تۆ، بەڵام هەر کاتێك هەست بە بێتاقەتی بکەیت، دنیای خۆت، لە خۆت تاڵ دەکەیت. دەست دەکەیت بە بەدبینیی شتەکان بە شێوەیەك، کە هیچ شتێك بوونی نەبێت. لە کاتێکدا هەستکردن بە باشبوونی خۆت، زۆر ئاسانترە. لەگەڵ ئەوەی کە زۆر ئاسانەو بەرهەمی بۆ تۆش زۆرە. کاتێك هەست بەباشی دەکەیت، لەشساغ دەبیت. هەڵبژاردنەکانی بەردەمت فراوان دەبن. هەموو شتێك بۆ تۆ زۆر دەرەوشاوەو جوان دەردەکەوێت. لە هەمووی گرنگتریش، هەستکردن بەباشی لە کێشانی ژیانی خۆتدا زۆر یارمەتیدەرت دەبێت. بەردەوام بە باوەڕبوون بەوەی کە هەست بە خراپی دەکەیت، خۆت چاڵی خۆت هەڵدەکەنیت.

**ڕەشبین:** هیچ لە من تێناگەیت وا نییە؟

**گەشبین:** زۆر باش لە تۆ تێدەگەم هەست بە کەساسبوونی خۆت دەکەیت؛ چونکە بە بۆچوونی تۆ، هیچ شتێك لەسەر ڕێڕەوی خۆی ناڕوات. سەیارەکەت خراپ بووە. منداڵەکانت زۆر هارن.. هاوڕێکانی سەر کارت، ڕقیان لێتە. لیستێکی نەبڕاوەت هەیە. دەزانم، بەڵام هەر شتێك بێت، با ببێت. لە هەر هەڵوێستێکدا هەیت، با ببیت، لە بابەتی «هەستکردن بە باشی»دا، دەبێت کۆشش بکەیت.

**ڕەشبین:** هممم. باشە چۆن دەتوانیت هەست بەباشی بکەیت؛ لە کاتێکدا هەموو شتێك خراپە؟

**گەشبین:** لەڕاستیدا بەشێوەیەك لە ناخەوە ڕۆڵ دەگێڕم، هەتا هەست بە باشبوون دەکەم.

**ڕەشبین:** تێگەیشتم. واتا بە بیرکردنەوەی ئیجابی، باوەڕ بە خۆت دەهێنیت، کە هەموو شتێك باشە.

**گەشبین:** ئەمە تەنها پەیوەندی بە بیرکردنەوەی ئیجابییەوە نییە، دەزانیت: مێشکمان وەکو پێکهێنەری کەهرۆموگناتیسی وایە، کە ئەو بیرکردنەوانەی کاریگەری دەکاتە سەر ژیانمان و جەستەمان بەرهەم دەهێنێت.. هەر بیرکردنەوەیەکی تازە، کە بەرهەم دەهێنێت، لەوەی پێشوتری دەچێت؛ لە تەنهاییدا کە ڕووبەڕوی ڕووداوێکی خراپ دەبێت. ڕاستەوخۆ لە مێشکیدا مەیل دەکات بە بەرهەمهێنانی بیرکردنەوەی خراپ. بۆ تۆ ڕەنگە زۆر نامەنتیقی بێت، کە هەموو شتێك خراپە، هەوڵدان بۆ بیرکردنەوەی باش، یاخود هەستکردن بەباشی، بەڵام ئەمە تاکە ڕێگایە، کە ژیان بگۆڕیت بەو ئاراستەیەی خۆت دەتەوێت.. کە دەست دەکەیت بە هەوڵدان بۆ باشبوونی خۆت دەبینیت، کە وەکو موعجیزە، شتی باش دێت بەسەرتدا. بەشێوەیەك دەبینیت، کە مرۆڤەکان تۆیان زیاتر خۆش دەوێت، بەشێوەیەکی خێراتر چارەسەر بۆ کێشەکان دەدۆزیتەوە. شایەت دەبیت بەوەی، کە مرۆڤەکانی دەوروپشتت زیاتر گرنگیت پێ دەدەن.

**ڕەشبین:** واتە هێندە ئاسانە؟ من ئەم هەموو کاتە، بەخۆڕایی ژیانی خۆم لەناو بردووە؟

**گەشبین:** دەمویست تۆ بهێنمە سەر حاڵەتێکی قورستر، بەڵام ناتوانم. بەڵێ، ئەم کارە هەر هێندە ئاسانە، تەنها دەبێت بڕیار بدەیت، کە دەتەوێت هەستت چۆن بێت؛ هەمووی ئەمەیە!

## ٥٠ مۆم بۆ ڕۆشنکردنەوەی ڕێگەتان

### مۆمی 32

# " میهرەبانی، نەك هێز! "

خودای گەورە، پێغەمبەرمان محمد (ﷺ)ی وەك ڕەحمەتێك ناردووە بۆ جیهان، بۆیە دەبێت هەموو موسڵمانێك شوێنکەوتەی پێشەوامان بێت، تا کەشی کۆمەڵایەتیمان؛ ڕەنگی هاوسۆزی، دڵسۆزی، بەزەیی‌و چاکە بگرێت. جارێکیان پێغەمبەرمان (ﷺ) حەسەنی کچەزای ماچکرد، لەم کاتەدا پیاوێکی لابوو، زۆر بەسەرسوڕمانەوە وتی: من دە منداڵم هەیەو تاکو ئێستا، هیچیانم ماچ نەکردووە، پەیامبەر سەیری کردوو فەرمووی: ئەوەی میهرەبان نەبێت لەگەڵ بەندەکانی خودادا، پەروەردگار لەگەڵیدا میهرەبان نابێت.

کچو کوڕەکانم، لەمڕۆدا جیهانگیری، گیانی هێزو دەسەڵاتو کێبڕکێ بڵاو دەکاتەوە، هەروەك دەبینن؛ لە ڕێگەی خولە بەرفراوانەکانی ڕاهێنان، کە گەنجان ئالوودەیان بوون‌و هەروەها ئەو بانگەشە بازرگانییانەی کە ئەژمار ناکرێن‌و لە ڕێگەی ئەو وتانەی لە دانیشتنەکاندا دووبارەو چەندبارە دەکرێنەوە. گومانی تێدا نییە، ئوممەتی ئیسلام، پێویستی بە زۆرترینە لە بەهێزان‌و سەرکەوتووان‌و هەڵکەوتووان، بەڵام نابێت، هەرگیز ئەمە؛ لەلایەن میهرەبانی‌و هەستکردن بەوانەی لە چواردەورمانن، باجەکەی بدرێت، میهرەبانی پەیوەستە بە بەخشین‌و هەوڵدان‌و چاکەکردنەوە، لەبەرامبەردا هێز پەیوەندی بە بردن‌و دەستکەوتن‌و بردنەوەو دەسەڵاتەوە هەیە، زۆر گرنگە، کە بەباشی درك بەمە بکەین.

کچو کوڕەکانم، کاتێك بەمیهر دەبین لەگەڵ هەژارێك، لاوازێك، خاوەن پێداویستییەك، هەتیوێك، نزیك دەبینەوە لە خودای- باڵادەست- بۆیە پێشەوامان (ﷺ) هەمیشە دەیفەرموو: " لاوازەکانتانم بۆ کۆبکەنەوە، با بێنە کۆڕو دانیشتنەکانمەوە؛ چونکە ئێوە، بەهۆی لاوازەکانتانەوە، سەردەخرێن‌و ڕۆزیتان پێدەدرێت".

**ئەمە چی دەگەیەنێت لای کوڕو کچەکانم؟**

١. هیچ کام لە ئێمە، با فریو نەخوات بە هێزو سامان‌و پلەکەی؛ چونکە دەیکاتە لووتبەرزێکی ڕفتەستوور، کە هیچ مانایەك بۆ بەزەیی دانانێت، خۆیشی دەخاتە بەر سزای خودای گەورە.

٢. هاوخەمی هەستە خەمگینەکان بن، کاریگەربوون‌و گرنگی پێدانتان نیشان بدەن؛ بۆئەوەی دەیبیستن‌و دەیبینن لە خەم‌و پەژارەی هاوپۆل‌و دراوسێ‌و برا موسوڵمانەکانتان، بەزەییتان پێیاندا بێتەوەو یارمەتیان بدەن.

٣. بەبەزەیی بن لەگەڵ یاوەرانتاندا، چاوپۆشی بکەن لە هەڵەکانیان، با هەر یەکێکتان خەیاڵی ئەوە بکات، کە ئەگەر لە شوێنی ئەواندا بوایە، چاوەڕێی چ چاکەو بەزەییەکی بۆخۆی دەکرد، تۆیش لەگەڵیاندا ئەوها بکە.

٤. یاخیان‌و تاوانباران سەرکۆنە مەکەن، بەڵکو بەزەییتان پێیاندا بێتەوەو لەگەڵیاندا میهرەبان بن‌و ئامۆژگارییان بکەن، هەوڵ بدەن بەرەو ڕێگەی ڕاست دەستیان بگرن.

٥. شایستەترین درووستکراو، کە دەبێت لەگەڵیدا میهرەبان بین، خودی خۆمانە؛ بەوە لەگەڵیدا میهرەبان دەبین، کە ڕزگاری بکەین لە سزای خودای گەورە، لە ڕێگەی خۆگری‌و کاری چاکە، هەروەها ڕەحمی پێ بکەین لە وەی هەمیشە بیشکێنین‌و سەرکۆنەی بکەین، بێگومان ڕاستیش نییە، کە هەر لە یەك بەرگدا بمێنینەوە؛ بە مەبەست بێت، یاخود بە بێ مەبەست، بەڵکو دەبێت هەر یەکێکمان، بەسەر کارەکانیدا بچێتەوە، سوپاسی خودا بکات، هانی خۆی بدات، هەندێك کات گەشبین بێت، هەندێ کات سەرزەنشتی خۆی بکاتو خۆی ناچار بکات؛ لە کردنی هەڵەو سەرپێچییەك دەست هەڵبگرێتو بوەستێت.



# زیرەکی و زیرەکیی هەمەچەشنە

## Multiple Intelligences

ئا: م: بورهان محەممەد شەریف/ مامۆستای زانکۆو ڕاهێنەری گەشەپێدانی مرۆیی

زیرەکی لە لای زانایانی دەروونناسی پێناسە دەکرێت، بە توانای ڕووبەڕووبوونەوەو بەرپەرچدانەوەی نارەحەتیو دژوارییەکان، لێهاتوویی خۆگونجاندنو خۆگونجانی لەگەڵ بارو حاڵەتو کەشە کتوپڕو لەناکاوەکان، پاشان چارەسەرکردنو کۆنترۆڵکردنی گرفتو کۆسپو لەمپەرو کێشەکانی ڕەوڕەوەی ژیانی تاکەکان.

بەگوێرەی ئەم پێناسەیە، سەنگی مەحەکی زیرەکیی مرۆڤەکان، لە چرکە ساتەکانی نارەحەتیو قەیرانو کێشەو گۆڕانکارییە قورسەکانە، نەك چرکەساتی ئارامیو پاڵدانەوەو پشووەکان، لێرەوە دەتوانین بڵێین: لەناوچوونو کۆتاییهاتنی دەینەسوورەکان، هەروەها خۆنەگونجاندنو نەگونجانیان لەگەڵ بارودۆخە ژینگەییەکاندا، هۆکارێکیان نەبوونی زیرەکی بووەو پێمان دەڵێن: دەینەسوور گیانلەبەرێکی زیرەك نەبووە.

ئەم پێناسەیە لە کاتێکدایە، پێناسەی تەقلیدی پێی وایە؛ زیرەکی بریتییە لە: توانای بیرکردنەوە، بەرهەمهێنانی لۆژیکیو ئاڕاستەکردنی ژیرانەو توانای گلدانەوەو کۆکردنەوەی زانیارییەکانو گەیشتنە پێیان، بەجۆرێك زیرەکی "انتیلیجینسی" لە ولایەتەکگرتووەکانی ئەمەریکا. واتە: دەزگاو ئاژانسی هەواڵگریی سەربازیو سیاسیی ئەمەریکایە، بریتییە لە: ئاژانسی کۆکردنەوەی زانیارییەکانو خەزنکردنو گلدانەوەو بەکارهێنانیانە.

بۆ تێگەیشتنی زیاتر لەزیرەکی، بیرۆکەی پێوانەکردنی زیرەکیی لە ڕۆژئاوا هاتە بوون، کە زیرەکی لەسەر بنەمای پێوانەکردنی هێزی چالاکییەکانە، کە ئەمەش بریتییە لە: -ئای کیو- بریتییە لە: ڕێژەی زیرەکیی تاك بۆ تێکڕایی زیرەکی لە کۆمەڵگا، سەبارەت بە منداڵان بریتییە لە: ڕێژەی تەمەنی ڕۆژگاری بەسەربردوو، بەراوورد بە تەمەنی ژیریی. قوتابخانەی "ستافورد – بینیە" بنەماکانی ئەم سیستەمە، وەك سیستەمی تێکڕایی زیرەکیی تاك لە کۆمەڵگا بریتییە لە: (١٠٠)، هەرکاتێك ڕێژەی زیرەکی، لە ١٠٠ سەرووتر بوو، واتە: مرۆڤێکی زیرەکە، شایەنی باسە زۆربەی تاکەکانی کۆمەڵگا ڕادەی زیرەکیان لە نێوان (٨٠-١٢٠)ەو کەمینەیەك ڕادەی زیرەکی دەکاتە ١٤٠، هەروەها بەگوێرەی توێژینەوەو ڕوپێوییەکان لە ١٠٠٠٠٠ کەس، تەنها یەکێکیان ڕادەی زیرەکییەکەی. دەگاتە زیاتر لە ١٩٠.

زۆرکات ئامڕازو پێوانەکردنی زیرەکی، بەهۆی تاقیکردنەوەیەك لە ڕێگای قەڵەمو کاغەزەوە، یان لە ڕێگای ئەلەکترۆنییەوە ئەنجام دەدرێت، بۆ مەبەستی پێوانەکردنی توانای ژیریو عەقڵی تاکەکان لە ڕێگای سێ تەوەرەی سەرەکی: (پێوانەکردنی توانای حسابو ژمێریاری، لۆژیكو داهێنانو توانای زارەکی (لفظی)و پاراویی زمان).

### هوارد گاردنەرو زیرەکیی هەمەچەشنە:

ساڵی ١٩٨٣، بۆ یەکەمین جار بیرۆکەی زیرەکیی هەمەچەشنە، لە لایەن زانای ئەمەریکی، دکتۆر هوارد گاردنەر (Howard Gardner) لە زانکۆی هارڤاردی ئەمەریکی، لە ئەنجامی توێژینەوەیەك لەسەر ژمارەیەك لە خەڵکی سەری هەڵدا، بە گوێرەی توێژینەوەکە، بۆی دەرکەوت مرۆڤەکان خاوەنی زیرەکیی جۆراو جۆرن لە بەڕێوەبردنی کارەکانیانو مامەڵەکانیان، هەندێکیان خاوەنی زیرەکیی بەرزن لە بوارێکداو لە هەمان کاتدا لاوازو خاوەنی وزەیەکی کەمن لە بوارێکی تردا، سەرەنجام بۆی ئاشکرابوو زیرەکیی هەمەچەشنە، ژمارەیان ٧ جۆرە، پاشان لە ئەنجامی بەردەوامی کارکردنی لەم بوارەدا، ساڵی ١٩٩٥ بۆی دەرکەوت؛ جۆری هەشتەمیش لە زیرەکی هەیە. شایەنی باسە گاردنەر بە دامەزرێنەری بیردۆزی زیرەکیی هەمەچەشنە دادەنرێت.

### جۆرەکانی زیرەکیی هەمەچەشنە:

١- زیرەکیی زمانەوانی، وەکو نووسەری ناوداری میسری نجیب مەحفووز.
٢- زیرەکیی ژیربێژی لۆژیکی (بیرکاری)، وەکو زانا ئەلبێرت ئەنیشتاین.
٣- زیرەکیی هەستی، وەکو مارادۆنا.
٤- زیرەکیی کۆمەڵایەتی، وەکو ڕابەری میللی هیندی: مەهاتما گاندی.
٥- زیرەکیی تاکی (فردی) وەکو ئەفلاتوون.
٦- زیرەکیی مۆسیقی، وەکو موسیقی بەناوبانگ بتهۆڤن.
٧- زیرەکیی وێنەیی(بصری) وەك بابلۆ بیکاسۆ.
٨- زیرەکیی ژینگەیی.









# وەڵامی بەجێ

لــە پەیامبــەر (یوســف)یان، پرســی: بۆچی تێر ناخۆیــت، لە کاتێکــدا خەزێنەو گەنجینەکانی زەوی، لە ژێر دەستی تۆدایە؟
لە وەڵامدا وتی: ئەگەر تێربخۆم، برسییەکانم لەبیر دەچێت!

لە (سوقرات)یان پرسی: ئایا لە مرۆڤدا عەیبو کەمو کورتی هەیە؟
لە وەڵامدا گوتی: ئەگەر لە مرۆڤدا عەیبو کەمو کورتی نەبووایە، ئەوا نە دەمرد!

لە پێشەوا (عەلی)یان پرسی: چەند هاوڕێت هەیە؟
لە وەڵامدا گوتی: ئێستا نازانم! چونکە دونیا ڕووی تێکردووم، خەڵکی هەموو هاوڕێمن! مــن کاتێــك دەزانم چەند هاوڕێــم هەیە، کە دونیا پشــتی تێکردم، باشــترین هاوڕێ ئەو کەسەیە، کە ئەو کاتەی دونیا پشتی تێکردی، ئەو ڕووت تێ بکات!

لە کابرایەکیان پرسی: کەی عاقڵ بوویت؟
وتــی: ئەو کاتەی کە لە دایکبووم! وتیان چۆن؟ وتی: کاتێك دایکم مەمکی لێ دەگرتمەوەو شیری پێ نەدەدام، دەگریام، ئەو کاتیش مەمکی پێدەدامو شیرم دەخوارد، بێدەنگ دەبووم!

پیاوێك بە هاوڕێکەی گوت: زانستو ماڵو سامان لە گەدەی مرۆڤەوە سەرچاوەیان گرتووە!
هاوڕێکەی وتی: چۆن؟
پیاوەکە وتی: دەست بەسەر ئارەزووەکانتدا بگرە، (واتە کۆنترۆڵی ئارەزووەکانت بکە)، ئەوا ماڵو سامانت زیاد دەکات، خواردنیش کەم بخۆ، زانستت زیاد دەکات!



# گۆرانی بڵێ بۆ ژیان



تەنها بێبەرنامەیی، بەئاسانی دەستەبەر دەبێت!

لویس مەمفۆرد، مێژوونووس

ناتوانم باوەڕ بەوە بێنم، کە ئێمە بێنرخین؛ ئەگەر وابا، خودا درووستی نەدەکردین!

جێرۆنیمۆ سەرۆکی هۆزەکانی ئەپاچی

ئەمڕۆ، یان سبەی، هەموو مرۆڤەکان دەزانن، کە بەختەوەریی ڕەها، لە دونیادا، دەستی کەس ناکەوێت، بەڵام کەمێك لە خەڵکی، بەپێچەوانەوە بیر دەکەنەوە؛ بۆئەوەی بزانن، کە داماوی‌و دەردەسەریی ڕەهاش، هەر دەستکەوتنی مەحاڵە!

پریمۆ لیڤی، نووسەر

* ئەگەر ئەو میوەیەی دەتەوێت بیخۆیت، تاڵ بوو، فڕێی بدە.. لە ڕێگاکەت دڕك هەبوو، لێی دوور بکەرەوەو بەردەوام بە لە ڕۆیشتن.. مەوەستە؛ بۆئەوەی سکاڵا بکەیت‌و بڵێیت: بۆچی جیهان پڕە لەم شتانە؟!

ـ مارکوس ئۆریلیوس، ئیمپڕاتۆری ڕۆمانی‌و فەیلەسووف

وا تەماشای شتەکان بکە:

هەرگیز هەژار نەبووم، من تەنها مایەپووچ بووم؛ چونکە هەژاری، سنوورێکی فیکرییە، بەڵام مایەپووچی، هەڵوێستێکی کاتییە!

مایك تۆد، دەرهێنەری سینەمایی





ئیبراهیم بەهادین خەتەیی

# گوارەکانی کچە تاقانەکەم

شەقام چۆڵو هێمنە، تاك تاكە خەڵكی بەدەرەوەن، یەکێك نانی بەدەستەوەیەو دەگەڕێتەوە ماڵەوە، پیاوێك دەمامکی کردووەو بۆ سەر کار هەنگاو دەنێت. هەناسەیەکی قووڵم هەڵکێشا، هەستم بە بۆنی بەهار کرد. هەمیشە بەهار هەستێکی نامۆ لە ناخمدا درووستدەکات. یادەوەری بۆنی نێرگزو دەنگی ڕووبارو چێژی بەیەکگەیشتن. تێکەڵ بە ئازاری دابڕانو مەرگو دەربەدەری. ئاوێتەیەکە لە خۆشیو ئازارەکانی ژیان، بە چەشنی تامی نوقڵێکی ترشو شیرین.

وا خەریکە تیشکی خۆر، بەشی سەرەوەی باڵەخانەکان ئاوزێر دەکات. لۆبیا فرۆشەکە خۆیو عارەبانەکەی لەسەر شۆستەکە وەستاوە، سێ چوار ژنو پیاوێك بەدەورییەوەن. خەڵکی بەچەشنی پوورەی هەنگ دەوری مێزی نانەواخانەکەیان داوە، دەستم بۆ گیرفانی پاڵتۆکەم برد، جووتە گوارە زێڕەکە هاتە ناو دەستم. گوارەکانم گەڕاندەوە گیرفانمو هەزار دینارم دایە دەستی منداڵێك، -کە پارەکانی سەر مێزەکەی ڕیز دەکرد- پێم وت: ئەو پارەیەش بۆ من لەسەرەکە دابنێ.

منداڵەکە وتی: مامە، دوانزە کەست لە پێشەوەیە.

هەمیشە بۆنی نانی برژاو بەرەو یادگارییەکانی منداڵیم دەباتەوە.

کاتێك لەگەڵ ئازادی برام لە حەوشەکەماندا بەدیار دایکمانەوە یاریمان دەکرد، بەستەزمانە ئەوەندەی بۆ ماڵە خواپێداوەکان نان کردبوو، دەستەکانی هەڵاوسابوون، ئافرەتێکی کزو داماو بەدەست بژێوی خۆیو دوو منداڵی بێ باوك حەسانەوەی نەبوو. حەزی دەکرد بە باشترین شێوە پەروەردەمان بکات، هەمیشە دەیگوت: کوڕم، کەس بە کەڵکی کەس نایەت. بۆخۆتان بخوێنن؛ بۆئەوەی چاوتان لە دەستی کەس نەبێت.

لەپڕ دەنگی منداڵەکە خەیاڵی پچڕاندم..

- ئەو هەزارە هی منە، دوو نانم بدەرێ... پاشان ڕووی لە من کردو وتی: مامە ئەوە پارەکەی تۆ بوو، نۆ کەست لەپێشەوە ماوە.

-باشە ڕۆڵە، دەستخۆش.

ئەو کاتەی باوکم گیانی لە پێناوی نیشتماندا بەخت کردو بۆ هەمیشە ماڵاوایی لێکردین، من تەمەنم نۆ ساڵان بوو. ئازادی برام دوو ساڵ لە من بچووکتر بوو، ئەو دایکە داماوەم بە دەردەسەرییەکی زۆرەوە ئێمەی گەورەکرد. حەزی دەکرد بخوێنینو ببین بە مووچەخۆر. دەیگوت: ئەوە وەسیەتی باوکتانە، هەرچەندە من کەم باوکی خۆمم بینیوە، بەڵام جارجار کە دەهاتەوەو چەند شەوێك لەلای ئێمە دەمایەوە، ئەو چەند ڕۆژە خۆشترین کاتەکانی ژیانم بوون. بەڵام لەبەرئەوەی

لەماڵ دەرنەدەچوو، بۆیە لەوە بێبەش بووین لەگەڵیدا بڕۆینە دەرەوە. ئیرەییمان بە منداڵانی تر دەبرد، کاتێك لەگەڵ باوکیان دەچوون بۆ بازاڕ. بەڵام لە هەمووی خۆشتر ئەو ڕۆژە بوو کاتێك چووینە گوندێکی دوور لەگەڵ دایکم -کە نامەیەکی لە باوکمەوە بۆ هاتبوو- بۆئەوەی لەگەڵ شۆفێرێکی گوندەکە سەفەر بکەین، یەکەم جاربوو شاخو کێوی ڕاستەقینە لە بەهاردا ببینم. ئەو دیمەنانەم تەنیا لە فیلمو وێنەکاندا بینیبوو.. شاگەشکە بووم کاتێك بینیم باوکمو سیامەندی مامم، لەگەڵ کۆمەڵێك پیاوی چەکدار پێشوازییان لێ کردین، ئەو ڕۆژە زۆر هەستم بە شانازی دەکرد، باوکم وەك پاڵەوانی فیلمەکان دەهاتە بەرچاو، پیاوێکی چوارشانەبوو، باڵای لە مامم درێژتربوو، سمێڵێکی گەورەو تەنکە ریشێکی ڕەشی هەبوو. بەڵام مامم ڕیشی خۆی تاشیبوو، وەك ئێستاش قەڵەو نەبوو، باوکم تێر ئێمەی لە ئامێز گرتو بە یەکەوە چووین بۆ سەرچاوەی ئاوی گوندەکەو ناو ڕەزو باخەکان، دیمەن گەلێکی زۆر جوانو دڵڕفێنم بینی، دواتر پێی وتم: هەرگیز لای هیچ کەس باسی ئەوە نەکەی تۆ ئێمەت لێرە بینیوە. لای هاوڕێکانت بڵێ چووبووین بۆ ماڵی پوورم، ئەوە دوایین جاربوو، ئیتر باوکی خۆمم نەبینییەوە. ئێستاش دیمەنی شاخو کێو، بەهارە گەشتو گوند، کانیو ڕووبار، هەستێکی نامۆی دژ بەیەك لە دەروونمدا دەجووڵێنێت. هەستی شانازیو چێژی دیدارو یادگاری باوەشی گەرمی باوك، لەگەڵ ئازاری هەواڵی مەرگو شەهیدبوون، لێکدابڕانو ئاوارەبوون لە ناخمدا تێکەڵ بە یەکتر دەبن. ئێستاش لە وەرزی بەهاردا، بێئەوەی کەس هەست پێ بکات، ئاوێتەیەك لە فرمێسکی خەمو شادی بە یەکەوە دەبارێنم.

کاتێك گەڕاینەوە شار، پڕ بەدڵ حەزم دەکرد لای هاوڕێکانم بە شانازییەوە باسی باوکم بکەم، بەڵام هەرگیز لای کەس باسم نەکرد. دراوسێکانمان وایاندەزانی باوکم لە موسڵ کرێکاری دەکات.

لەگەڵ دەنگی نانەواکە بە ئاگاهاتم: ئەو پارەیە هی کێیە؟

وتم: چوار نانم بدەرێ.

وتی: کاکە لە کوێ بووی!! دەنگم کەوت ئەوەندەی هاوار بکەم!

- ببوورە برام ئاگام لێنەبوو.

کە گەیشتمەوە ماڵەوە خەرمان چایەکەی ئامادە کردبوو. تابانی کچیشم لەخەو هەستابوو، تەمەنی چوار ساڵانە، زۆر ئاوەدانو بە پرسیارە. خۆی کرد بە باوەشماو وتی: بابەگیان گوێم ئازاری هەیە، ماچێکم لێکردو بردمە بەردەم ئاوێنەکەو پێم وت: سەیرکە گوێت ساغو سەلامەتە.

- بابەگیان گوارەیەکی زێڕی وەك هی من، بۆ دایکیشم ناکڕیت؟

- گیانەکەم. هەرکاتێك مووچەم وەرگرت بەیەکەوە دەچین بۆ بازاڕو گوارەیەکی جوانی بۆ دەکڕین.

-باوکە دەخیلەکەم پێنج هەزاری جەژنانەی تێدا ماوە، دەیدەم بە دایکم بۆئەوەی گوارەی پێ بکڕێت.

- نا ڕۆڵە گیان، ئەوەیان بۆ خۆت شتێکی تری پێبکڕە. دەی ڕۆڵەگیان ئێستاش وەرە با چاوەکانمان بشۆینو ئینجا نانەکەمان بخۆین.

پەڵەهەورەکان لەگەڵ تیشکی خۆردا لە چاوشارکێدابوون. هێدی هێدی دوکانەکان دەکرانەوە، بیرم ئەوەندە ئاڵۆز بوو، هەستم بەڕێگاکە نەکردبوو. خۆم لەبەردەم چایخانەی مەجکۆ بینییەوە.

لەسەرەتای نەوەدەکان، ماوەیەك ئازاد لەو چایخانەیەدا شاگرد بوو.

ئازاد هەمیشە حەزی بە خوێندن نەدەکرد، بە گیانە جەفا سەرەتایی تەواو کرد. هەر چەندە گوزەرانمان باش نەبوو، بەڵام هەر چۆنیك بوو، من پەیمانگای مامۆستایانم تەواو کرد، دایکم زۆری لەگەڵ ئازاد دەکرد، لە خوێندنەکەی بەردەوام بێت، دەیزانی ئەگەر نەخوێنێت مامم لەگەڵ خۆی دەیبات بۆئەوەی چەك هەڵگرێت.

مامم هەمیشە دەیگوت: کوڕم پێویستە ڕێچکەی باوکتان بگرن. ئەو کاتە مامم بەرپرسێکی گەورە بوو، بەڵام لەڕاستیدا ئەو مامە سیامەندەی جاران نەبوو. کورتییەکەی لە ناوەڕاستی نەوەدەکاندا ئازاد ناوی لەلای مامم تۆمارکرابوو، ئەو کاتانەی لە ماڵەوە بوو دەچووە کرێکاری. کاتێك مامم بیویستایە لەگەڵ خۆی بیبات، بەدوایدا دەهات، ئازاد حەزی نەدەکرد لەبەر دایکمو منداڵەکانی بچێتە شەڕ، بەڵام ناچاربوو، مامم هەموو جارێك دەیگوت: ئێوە ئازاد هاندەدەن خۆی بشارێتەوە. من لێی بێ دەنگ دەبوومو دایکیشم لە بەرامبەر ماممدا دەسەڵاتی نەبوو. تەنیا ئەوەندە نەبێت، کە هەمیشە دەیگوت: زۆرم مەینەتی کێشاوە، بەرگەی کۆستێکی دیکە ناگرم!

دوێنێ ئێوارە، کاتێك ئازاد تەلەفۆنی کردو وتی: خەمی ئێمەتان نەبێت، دوو ڕۆژە ناوچەی ئێمە ئارامترە، تەنیا شەوان جارجار تەقەمان بەسەردا دەکەن. دواتر وتی: (کاکە هێمن، ئاشنا لە ماڵەوە پارەی خەرجی لانەماوە، ئەگەر دەتوانی بڕێك پارەی پێ بدە، هەر چەندە ئێمەش تا ئێستا مووچەمان وەرنەگرتووە، بەڵام دە ڕۆژێکی تر خۆم دەگەڕێمەوە).

نازانم ئەو جەنگە نەگریسە چی بوو لەو کاتە بۆمان هاتە پێش.. ماڵ خۆی نەبوو، میوانیشی هات.. لە ڕووم نایەت ئیتر پارە لە ناسیاوەکانم قەرز بکەم، ئەو بارودۆخە کاری لە هەموو کەسێك کردووە، تەنیا کەسانی وەك مامم نەبێت، لاتان سەیر نەبێت، زۆرجار شوکری خوا دەکەم باوکم ئەو ڕۆژەی نەبینی!

ئەوانەی هاو شێوەی مامم، خۆیانو منداڵەکانیان، پۆشتەو پەرداغ، مووچەیەکی خانەنشینی پلە یەك، خانووی جوانو جلی جوانو ئۆتۆمبێلی جوانو.... باڵەخانەو کۆمپانیا، گردو مەزرەعە.... ئەسڵەن بە خەیاڵیشیاندا نایەت شەڕێك لە ئارادایەو دوژمن هەڕەشەمان لێدەکات!

ئێمەش سەرەڕای ئەو هەموو ڕاکە ڕاکەو ماندوو بوونە، مووچەیەکی (هەیەو نییە)، لە بەرامبەر ئەو هەموو پێداویستیانەی ژیان... هیچ نەبێ من شەوان دەگەڕێمەوە ماڵی خۆم، بۆ لای خەرمانو تابان، بەڵام ئازادو ئەوان هیچ کاتێك بە تەمای خۆیان نینو لەماڵەوەش کۆشێك گرفتو کێشەیان جێهێشتووە!

گەیشتمە دوکانی زێڕنگەرەکەو جووتە گوارەکەم فرۆشت، هیچ نەبێت خەرجی ئەم هەفتەیەی براژنەکەم دابین دەکات. دوێنێ ئێوارە زۆرم بیرکردەوە، چارەیەکی ترم نەبوو، جگە لەوەی جووتە گوارەی کچە تاقانەکەم بفرۆشم، ناچاربووم فێڵ لەو ڕۆحە بچووکە پاکو بێگەردە بکەم، جیاوازیم چییە لەگەڵ کەسانی وەك مامم؟ ئەوانیش فێڵ لە کەسانی سادەو دڵپاك دەکەن.

ئێمەی مرۆڤ، هەرچەندە گەورەتر دەبین، دڵڕەقتر دەبین. ڕقم لە خۆم دەبێتەوە، ناچاربووم گوارەیەکی هەرزانی هاوشێوەی گوارە زێڕەکەی بۆ بکڕمو بێئەوەی هەست بکات، لە گوێ بچووکەکەی بکەم.

تاقانە خۆشەویستەکەم، من ناچار بووم، داوای لێبوردن دەکەم!





# گەورەیی ... پیشەیە

و: چیمەن لەتیف

پیکاسۆ، وێنەکێشی بەناوبانگ ڕۆژێك بە شەقامێکدا پیاسەی دەکرد، لەو کاتەدا ئافرەتێك کە یەکێك بوو لەو کەسانەی زۆر سەرسام بوو بە پیکاسۆو وێنەکانی زۆر بەلاوە دەگمەنو ناوازە بوو، پاش سڵاوو خۆناساندن، لە جانتا دەستییەکەیدا کاغەزێکی دەرهێناو پێی گوت: ئایا بە کێشانی وێنەیەك لەداهێنانەکانت لەسەر ئەم کاغەزە، شەرەفمەندم دەکەیت؟!

پیکاسۆ بە زەردەخەنەوە کاغەزەکەی لێ وەرگرت، پاشان دەستی کرد بەڕەشکردنەوەی کاغەزەکە تا وێنەکە بەرجەستە بوو، دواتر کاغەزەکەی ڕادەستی ئافرەتەکە کردو وتی: خانمەکەم پارێزگاری لەم کاغەزە بکە، ڕۆژێك دادێ بە یەك ملیۆن دۆلار دەیفرۆشیت!!

ژنەکە بە سەرسوڕمانەوە وتی: بەڕێز پیکاسۆ، تۆ تەنها سێ چرکە لەگەڵ ئەمکارەدا کۆششت کرد، تا ئەم تابلۆ گچکەیەت نەخشاند، ئایا ئەم کۆششە کەمە، ئەم بەرهەمە خەیاڵییە دەکات؟

پیکاسۆ بە زەردەخەنەوە پێی گوت: خانمەکەم بەندە (٣٠)ساڵی تەمەنم هەوڵم داوە، تا لە (٣٠) چرکەدا بتوانم کارێکی وا ناوازە بکەم.

لەمیانەی ئەوگفتوو بێژەی ڕابردوودا، هونەرمەندی ناودار، پەیامێکی لە ئەوپەڕی گرنگیدا گەیاندە بەرامبەرەکەی، ئەوەش ئەوەیە داهێنان لە پێکهێنانیدا کاتێکی زۆری ناوێت، ئەم تێگەیشتنە ئەوە ناگەیەنێت داهێنان کارێکە لە جیاکاریدا ناتەواوە، یان کارێکی سادەیە دەکرێت چاوی لێبکریت.

ئەو ئاستەنگانەی ڕووبەڕووی داهێنەر دەبنەوە، تا لەسەر پای خۆی دەوەستێت، ڕەگاوڕۆن، ڕەقەنن، گاڵتەیان پێ ناکرێت، ئەو بەرکەوتنانەی "ئەو پارچانەی" بەهرەی داهێنەریان پوختەکردووە، هەرگیز نابێت بە کەم تەماشایان بکرێت.

ئەم تێڕامانە، پاڵمان پێوە دەنێت بۆ ڕاستییەکی گرنگ، پێویستە لەسەری هەڵوەستەیەك بکەین، ئەوەش پێویستە ببەخشینو بەخشندەبین، بەرلەوەی بووەستینو وەربگرین.

دروێنە پێش پێگەیشتنی چێنراوەکە نابێت، لێپرسینەوە پێش کردار ناکەوێت، ناکرێت بەر لە کۆتایی جەنگ تاجی سەرکەوتن بنرێتە سەر شۆڕەسواری مەیدان.

زانای گەورە (ئیبن عطاالله ئەسکەندەری): لە یەکێك لە حیکمەتەکانیدا دەڵێت: قەوارەت"وجودت" لە زەوییەکی سستدا بشارەوە، بەدڵنیاییەوە ئەوەی نەکرێت بەژێر زەوییەوە بەرهەمێکی نابێت.

ئەم زانایە دەیەوێت لەسەر دەرکەوتنو درێژەدان بە ئەرکێك سەر بەرزانە فێری ئارام گرتنت بکات، هیچ تۆوێك نییە لەسەر زەوی بڕوێت، تا لەناخی زەویداو بۆ ماوەیەك ئامادە نەکرێت، ئەگەر کاری پێچەوانە ڕوویدا، ئەوا زێتر نزیکە لە تێکشکانو ڕۆچووندا. ئەوە سوونەتی گەردوونە، هیچکات ناتوانرێت بەرهەڵستی بکرێت.

هەر کەسێك واگومان ببات بەخوێندنەوەی پەرتوکێك، یان چەند کتابێك دەبێت بەبیرمەند.. یان ئەدیب.. ئەوە خەرەفاوە، هەریەکێك واگومان بەرێت بەلەبەرکردنی چەند سورەتێکی کورت لە کەلامی خودا، یان ئەزبەرکردنی چەند فەرموودەیەكو لەبەرکردنی واتاوماناکانی، یاخود بە لەبەرکردنی پۆشاکی فەتوا دەبێت بە موفتی، ئەوا مەفتونە.

زانایان، گەورە پیاوانو بیرمەندان، ئێمە کە لە کۆڕیاندا دادەنیشین؛ بۆئەوەی لێیانەوە فێربین. ئەوانیش بێ ماندووبوون لەدەرگای زانیندا وێستاون، بەرگەی ئەو نارەحەتیانەیان گرتووە کە لەبەدەستهێانی زانستدا تووشیان بووە، بەم شێوەیە سوننەتی پەروەردگار لەگەردوندا تەواو دەبێت.

دەروونت لە دووشت بپارێزە، خۆت دەربخەیت لەبوارێکدا بەر لەوەی لەو بوارەدا تەواو لێهاتوو بیت، توانایەك بەدەست بهێنیت، بۆئەوەی چاوی خەڵکت لەسەر بێت (غەزالی)!



# ئەوانەی خۆیان خۆشناوێت!

ن: د.حذیفة العمقی
و: فێنك جمال

ئەگەر تۆ خۆت خۆشدەوێت، ئەوا هەواڵێكی خۆشە، چونكە زۆربەی خەڵكی دونیا خۆیان خۆشناوێت.

ڕەنگە بپرسی چۆن؟ ڕەوایە كەسێك هەبێت خۆی خۆش نەوێت؟!!

لە وەڵامدا دەڵێین: بەڵێ.

ئەو كەسەی جگەرە دەكێشێت، ئەو كەسەی گرنگی بە تەندروستی خۆی نادات، ئەو كەسەی زۆر دڵی و كەم كار دەكات، ئەو كەسەی پەیوەندی بەهێزو باشو جوانی نییە لەگەڵ دەوروبەردا..... ئەوانە خۆیان خۆشناوێت.

لەبەرئەوە لە ئێستەوە خۆت خۆش بوێت، زۆر مەخەوە، زۆر مەخۆ، چونكە زۆر خەوتنو زۆر نووستن، دەبنە هۆی نەخۆشیو قەڵەویو ماندووبونو كات بەفیڕۆدان.

گرنگی بدە بە جیهانی ناوەوەتو دەرەوەت، بە سەركەوتنەكانت خۆشحاڵو ئاسوودەبەو شادومان بە.. هێمنی خۆت بپارێزەو كەسێكی ئارامو لەسەرخۆبە لە ژیانتدا، زۆر نزیك بە لە پەروەردگارتو داوای بەرزترینو خۆشترین شوێنی بەهەشتی لێ بكە.

زۆر بخوێنەرەوە، سەبارەت بە مێژوو، بابەتی پزیشكیو ئەندازیاریو تەكنەلۆژیاو ژیانی گەورە پیاوانو... هتد.

سەرنجی دەوروبەرت ڕابكێشە بە جوانترینو بەرزترین هەڵسوكەوت، لە هەموو بارودۆخێكی خۆشو ناخۆشو سەختدا.

بەردەوام ئامانجەكەت بكە بە تەوەرەی یەكەم، هەمیشە كۆتا كەس بە لە بەرزكردنەوەی دەنگدا، ڕازی بە بەڕابردووت، بە باشو خراپەوە، چونكە سەركەوتووەكان لە مێژوی ئێستادان، نەك لە یادەوەری كۆندا.

بەتەواوەتی لە جەنجاڵی ژیان وەرە دەرەوە.

ئەو كاتە جێ پەنجەت بە زیندوویی دەمێنێتەوەو هەموو دونیا دەزانێت كە هێشتا زیندووی.

*** چی داهاتووت دیاری دەكات!!**

ئەم جیهانە دان نانێ بە كەسێكدا گەر كەسێك دانی پێدا نەنێ... ڕێزی نەگرێ....جێپەنجە جێنەهێڵێو كاریگەری نەبێت.

پاش تێپەڕبوونی چەندەها ڕۆژو مانگو ساڵ، لە چەندین ئەم شارو ئەو شاركردنو چاوپێكەوتن لەگەڵ زۆر لە سەركەوتووەكانی دونیا.

ژمارەیەكی زۆر لە شكستخواردووەكان!! ئەوانەی دوای دواكەوتووەكان كەوتوون...

ئەوانەی بڕیاریان داوە لە كۆمەڵەی دەستی خوارەوە بن...

ئەوانەی دەرگاو پەردەیان لەسەرخۆیان داخستووە...

ئەوانەی گەورەترین بەربەستیان خستۆتە نێوان خۆیانو سەركەوتنیان...

ئەمانە بڕیاریان داوە پێش خۆیان بمرن!! بەردەوام لە ژێر لۆمەی دەوروبەردا بن!!

لە كۆتاییدا جیاوازی شكستخواردوو سەركەوتووم بۆ دەركەوت، ئەویش تەنها كردەویە.

كردەوە وای لە ستیف جۆبز كرد ببێتە خاوەنی كۆمپانیای ئەپڵ.. وای لە عەباسی فرناس كرد بفڕێ.. وای لە موتەنەبی كرد، ببێتە گەورەترین شاعر.. گەورەترین بەلگەشمان پەروەردگار دەفەرموێ: (وقل اعملوا فسیرى الله عملكم ورسوله والمؤمنون)..

نافەرموێت: ئاوات بخوازن، بەڵكو دەفەرموێت كار بكەن، كردەوە نەك هەر هیچ دەكاتە هەموو شت، بەڵكو ئەستەمەكان دەكاتە بەدیهێنراوی ئاسانو ڕاستەقینە.

كاتێك بە تەواوی پشت بە خودا دەبەستیتو دەست بە كار دەكەیت، هەست دەكەیت تەركیزت زیاد دەكاتو چەند كاتت بۆ دەگەڕێتەوەو دوور دەكەویتەوە لە تەممەڵیو دوودڵی.

هەڵیان خەڵەتاندووی گەروتویانە: ناتوانی....

تۆش بە كردەوەكانت وەڵامیان بدەرەوەو، باقی بۆخۆیان بەجێبهێڵە با زیاتر كاتت بە فیڕۆ نەڕوات.

پێت دەڵێن كێشەكە ئەوەیە كە كۆمەڵگاكەمان نەرێنیو دژی هەموو سەركەوتنێكن!!

منیش دەڵێم: ئینجا كۆمەڵگا هاوكاری سەركەوتووەكانی كردووە!!

گەر ژیانی هەموو سەركەوتووەكان بخوێنیتەوە، لە عەرەبو عەجەم لە ئافرەتو پیاو موسوڵمانو جولەكەو مەسیحی، ڕەش پێستو سپی پێستو داهێنەرو سەركردەو... هەموویان دەبینی كە كۆمەڵگا دژیان بووە، پێغەمبەری ئازیزی (سەلامی خوای لێبێت) تەنانەت نزیكترین كەسیشی دژی بووە... پێشەوا یوسف تەنانەت براكانیشی هەوڵی كوشتنیان دا!!

هەموو ئەو كەسانەی سەركەوتوونو منو تۆو چەندەهای تر، لە دژمانن، بەڵام هیچ شتێك لە كۆنو تازەماندا ناگۆڕێت!

چیا عەبدوڵا

# ڕێگەکانی ڕزگاربوون لەترس

ئێستاوەرە با بۆدوورتر بڕۆینو زیاتریش قووڵ ببینەوە لەڕێگای سەرکردایەتی خودەوە، بۆ دۆزینەوەی ئەو ڕێگایانەی کە ڕزگارمان دەکات لە ترسەکانمان، بەتایبەت ئازادبوونمان لە ترسێك کە ڕەنگە بەدرێژی تەمەن ئازاری دابێتین:

**ڕێگەکانی ڕزگاربوون لەترس:**

پێویستە بزانیت کەترسی نەخۆشییەکە پیێ دەوترێت: (فۆبیا) ترسێکی (نامەنتیقیە- نابەجێیە)، باوەڕهێنانی قووڵ بەوەی کە ئەمە ڕاستییە، مانای ئەوە نییە کەلای هەموو کەسێك ئەمە ڕاستی بێت، پرسیارێکت لێدەکەم تۆ واگومان دەبەیت کە هەموو کەسێك ترسی هەبێت لە فڕۆکە؟ بێگومان نەخێر، ئەی سەبارەت بەشوێنی بەرزو ترس لە ئاژەڵانو مێشو مەگەزو ترس لە شوێنی داخراو، یان هەرشتێکی ناخۆشی تر، وا گومان دەبەیت کە هەموو کەسێك هەست بەو ترسە دەکات؟ بێگومان نەخێر، وایە؟

بەڵام ئەو کەسەی کە دووچاری ئەو ترسە نەخۆشییە بووە، ترس لای ڕاستەقینەیە بەهۆی شتێك کە لە ڕابردوودا ڕوویداوە، بیناش لەسەر ئەمە ئەوە تۆ نیت کە ئەو ترسەت هەیە، بەڵکو تۆ وەکو کەس لە ڕابردوودا ئەو ترسەت هەبووە، چونکە ئێستا تۆ ئەزمونەکانتو لێهاتووییەکانتو تەمەنت جیاوازە، ئەم ترسەت لە ڕابردوودا لەگەڵ خوددا ماوەتەوە لە ماوەی چەندساڵدا، باوەڕت وابێت کە کاتی ئەوە هاتووە ئازادبێت لەهەر ترسێكو خۆشی لە ژیانت ببینیت دوور لە هەموو کۆتو بەندێك.

بەردەوام لەیادت بێت کە دەتوانیت پێکهاتەی هەر ترسێك بگۆڕیتو ڕزگارت بێت لێی، نموونەیەکی تر لەگەڵ چەند پرسیارێکدا: ئایا حەزت لەبینینی فیلمی ترسناکە؟ گەر وەڵامەکەت بەڵی بێت، ئایا دەتوانیت دوای یەکی شەو بەتەنیا سەیری بکەیت؟ کە فیلمەکەش تەواو بوو، ویستت بچیت بۆ سەرئاو ئایا چەندجار ئاوڕ دەدەیتەوە؟ ئێستا ئەگەر بەڕۆژ سەیری فیلمێکی ترسناکت کردو لەگەڵ هاوڕێکانیشتدا بیت، ئایا هەستو شعورت وەك ئەوەی شەو دەبێت؟ بێگومان نەخێر، وایە؟!

ئایا بەوردی کام شتە مەترسیدارەو تۆ دەترسێنی؟ ئایا وێنەکەیە، یان دەنگەکەیە، یاخود هەردووکیانە؟ هەردووکیانە.. وایە؟ بەڵام ئایا ئەگەر شاشەیTV یەکە زۆر زۆر لێتەوە دووربێت، هەمان هەستو شعورت دەبێت؟ نەخێر، خۆگەر شاشەیTV یەکە زۆر زۆر بچووك کەینەوە، ئایا هەستو شعورت، یان ترسەکە هەمان شت دەبێت؟ نەخێر، ئێستا وەرە بایاری بە دەنگەکەش بکەین، گەر بە



تەواوەتی دەنگەکەی بوەستێنیت، ئایا هەستت هەمان شێوەی یەکەم جار دەبێت؟ گەر ئاوازێکی سێرکی بخەینە سەر، یان ئاوازی گۆرانییەکی لای خۆمانی بخەینە سەر، ئایا لە کاتی سەیرکردنی فیلمەکەدا بەو دەنگەی خستمانە سەری، هەستت هەمان شت دەبێت؟ نەخێر، ئێستا بایاری لە وێنەی فیلمەکەدا بکەین، گوێچکەی کەروێشك بخەینە سەر هەموو ئەکتەرەکانی ناو ئەو فیلمە ترسناکە! ئایا هەست بە هەمان ترسی یەکەم جار دەکەیت؟ ئێستا یاری لە دەنگو وێنەکەشدا پێکەوە دەکەین، گۆرانییەکی لەمەڕخۆمان بخەرە سەر دەنگەکەیو گوێچکەی کەروێشکیش بخەرە سەرسەری هەموو ئەکتەرەکانی ناو فیلمەکە، هەردووکیان لەیەك کاتدا، ئایا لەم کاتەدا کە سەیری ئەو فیلمە ترسناکە دەکەیت بەو شێوەیەی سەرەوە هەستت وەك هەستی یەکەمجار وایە؟ ئایا بڕوات وادەبێت کە ئەمە فیلمی ترسناکە، یان کۆمیدی؟ بێگومان فیلمی ترسناك نابێت ئەو کاتە، هۆکارەکەی چییە؟ هۆکارەکەی ئەوەیە کەپێکهاتەی ئەزمونەکە بەتەواوەتی گۆڕا، بەم شێوەیە شێوە ڕوانینی تۆ بۆ ئەو ئەزموونە بەتەواوەتی دەگۆڕێت.

ئێستا با بەتەواوەتیو بۆ هەمیشە ئازادبین لەترس، بەڵام ئەوەبزانە کە ئەم چارەسەرە بۆ حاڵەتە مەترسیدارەکانی نەخۆشی ترس تاکە ڕێگانییە، بەڵکو ئەو حاڵەتانە پێویستی بەچاودێریو پرسو ڕاوێژی پزیشکی هەیە.

بۆ ئەم تاقیکردنەوەیەش، وا باشترە کەسێکی نزیکت، یان هاوڕێیەکت لەگەڵ بێت، ئێستا ئامادەیت؟ وەرە باپێکەوە دەست پێ بکەین:

وابهێنەرە پێش چاوت لە هۆڵی سینەمایەکدایت لەناو هۆڵەکەدا خەڵکێکی زۆری لێیەو دەوروبەرت کەسە نزیکەکانتی لێیەو هەست بەئارامی دەکەیت، چونکە دووکەس زۆر نزیکن لەملاولاتەوە، وەك دایكو باوکت، یان هاوسەرت، یان خوشكو براکانت، شاشەیەکی گەورە لەبەردەمتاندایە، کە ئەو فیلمە ترسناکەی لەسەر نمایش دەکرێت، لەیادت بێت تۆ تەنها بینەریو لە تەنیشتەوە کەسە خۆشەویستەکانتەو دڵیان لەلاتە، دەستت دابخە بەشێوەی دەستی بۆکس وەشێنەکان، ئەویش بۆ وەبیر هێنانەوەت کە تۆ بەشێك نیت لەناو فیلمەکە، بەڵکو تەنها بینەری، وەك ئامادەبووانو تەحەکومیش دەکەیت بەفیلمەکەوە، دەست بکە بەلێدانی فیلمەکەو کۆتاییەکەشی لێ بدە کە لەو کاتەدا هەستت بەترس کردووە، دەست بکە بەلێدانەوەی فلیمەکە لەسەرەتاوە تا کۆتایی، فلیمەکە بووەستێنە، ئێستا وابهێنەرە پێش چاوت کە دەڕۆیتە ناو شاشەکە بۆ ناو فیلمەکە، لەناو فیلمەکەدا شریتەکە بەپێچەوانەوە بگەڕێنەرەوە سەر سەرەتا، بەڵام زۆر بەخێرایی وەك فیلمەکانی شارلی شاپلن (٥) جار ئەم فیلمە لێبدەرەوە بەپێچەوانەوەو بەهەمان خێرایی، ئێستا فیلمەکە بەپێچەوانەوە لێبدەرەوە، بەڵام گوێی کەروێشك بۆ هەموو ئەکتەرەکان تاکۆتایی فیلمەکە دابنێو ئاوازێکی گۆرانی لەمەڕ خۆشمانی بخەرە سەر، پاشان بەقووڵی هەناسە بدە سێ جار،ئەم کاری هەناسەدانە ئەنجام بدە(.........)، لەگەڵیدا سێ جاریش بڵێ:

(من ئازادبووم لەترس، من ئازادبووم لەترس، من ئازادبووم لەترس) لەگەڵ سێ جار: (من بەهێزم، من بەهێزم، من بەهێزم)، چاوەکانت بکەرەوەو سەرو شانت بجووڵێنە، ئێستا هەستت چۆنە؟ با دڵنیابین لەوەی ئەم ڕێگایە سەرکەوتووەو کاریگەری هەیە، ئێستا وابهێنەرە پێش چاوت لە ئایندەدایتو لە هەڵوێستێکدایت کە لەڕابردوودا ترسێکی زۆرت هەبووە لێی، ڕەچاوی هەستت بکە، گەر هەستت ئاسایی بووە، ئیجابی بوو ئەوا تۆ ڕزگارت بووە لە ترس، بەڵام گەر هەستت هەر بەوشێوەیەی خۆی نەرێنی بوو، ئەوا ڕاهێنانەکە دووبارەبکەرەوە، ئێستا وابهێنەرە پێش چاوت بەهێزیو متمانەت بەخۆت هەیە ئازادیت، ئەم وێنەیە گەورە بکەو هەموو ئەو ڕەنگانەی کە تۆ حەزت لێیەتی بیخەرە ناو وێنەکەوە، بچۆرە ناو وێنەکە بەو هەستانەوە بژیو ڕەچاوی بەهێزی خۆت بکە، لە وێنەکە وەرە دەرەوەو (٣) جار بەقووڵی هەناسە هەڵمژەو لەگەڵ هەر هەناسەیەکدا وێنەکە بهێنەرەوە خەیاڵت، ئێستا چرکەیەك ڕاوەستە، سوپاسی خوا بکە، پاشان سوپاسی عەقڵی بێئاگات بکە، چونکە ڕێگەی ئازادی بۆ ڕۆشن کردیتەوە، لەسەرەتای ئەمڕۆوە سەرەداوی کارەکانی ژیانت بگرە دەست، خۆت لە بازنەیەکی بەتاڵدا بەند مەکە، هەر هەمان شت بەردەوام دووبارە بکەیتەوە کە لەسەری گەورە بیت، هەر بۆشاییەك لە ژیانت هەیە پڕی بکەرەوە، دەست بکە بە مومارەسەی حەزەکانت وەك (وەرزش- وێنەکردن- چێشتلێنان- یان هەر شتێك کە تۆ حەزت لێیەتی..)، گەر ویستت کەسێك هەڵبژێری بۆ وتووێژکردن لەگەڵیدا، بۆ چارەسەرکردنی کێشەیەك، کەسێك هەڵبژێرە خاوەنی زانستو ئەزموون بێت، بۆئەوەی هاوکاریت بکات، نەك کەسێك ئەوەندەی تر کێشەکانت زیاد بکات.

(لەبازنەی ڕابردوودا خۆت بەند مەکە، چونکە گەر تۆ مایتەوە لە ڕابردوودا، ئەوا ڕابردوت دەبێتە ئێستاو ئایندەشت، لە دەست دەچێت)!

(بەلایەنی کەمەوە هەفتەی یەکجار شتێکی باش پێشکەش بەخۆت بکە، سەیری فیلمێکی کۆمیدی بکە، یان پەرتوکێکی خۆش بخوێنەرەوە، یان خۆت بانگهێشت بکە بۆ نانخواردنی دەرەوە..).

(چەند ڕۆژێك پشوو وەربگرە، یان هیچ نەبێت پیاسەیەك بکەو خۆشی ببینە لە جوانی سرووشت).

(زۆر پێبکەنە، ژیان زۆر لەوە کورتترە، کە ئاوا بەفیرۆی بدەین).

(تەرکیز بخەرە سەر ئەو شتەی کە حەزت لێیەتی، چونکە ژیان ئەو مانایەی هەیە، کە تۆ دایدەنێیت بۆ خۆت).

(ژیانت زۆر نایاب بکە، چونکە هەموو ڕۆژێك بریتییە لە سەرەتایەکی نوێو هەموو چرکەیەك بەخششێکی خواییە).

بەردەوام لەیادت بێت:

هەموو چرکەساتێکی تەمەنت بژیو وابزانە کۆتا ساتی تەمەنتە.. بە ئیمانەوە بژی.. بە ئاواتەوە بژی.. بە خۆشەویستییەوە بژی.. بە هەوڵدانەوە بژیو بەهای ژیان بزانە.

ئەو منداڵە بێباوکانەی ڕێڕەوی مێژوویان گۆڕی!



# شێخ عەبدوررەحمانی سەعدی

## (١٣٠٧-١٣٧٦) کۆچی

بەرزان ئەبوبەکر

**کەشتی زۆر نارامە ئەو کاتەی لە کەناری دەریا لەنگەری گرتووە، بەڵام ئایا کەشتی بۆ ئەوە دروستکراوە کە لە کەناری دەریادا لەنگەر بگرێت؟!**

شێخی سەعدی کێیە؟

سەعدی ناوی (عبدالرحمن کوڕی ناصری کوڕی عەبدوڵا)یە، لە بنەماڵەی سەعدی لە هۆزی تەمیمە، لە بەرواری ١٢ موحەرڕەمی ساڵی (١٣٠٧)ی کۆچی لە شارۆچکەی عەنیزە سەر بە پارێزگای قەصیم لەدایکبووە، شێخی سەعدی تەمەنی چوارساڵان بووە، کە ئەزیزترین کەسی ژیانی، دایکی میهرەبانی ماڵاوایی لە ژیان کردووەو شێخی سەعدی بێ ناز جێهێشتووە، مردنی دایکی کۆتا خەمی شێخی سەعدی، یاخود بڵێین ئەو (منداڵە چوار ساڵانەی ئەو کات) نەبوو، بەڵکو لە تەمەنی حەوت ساڵیدا باوکیشی کۆچی دوایی کردو بۆ هەمیشە ماڵاوایی لە ژیانو لە کوڕە تاقانە بێ نازەکەی کرد، لێرەوە ژیانێکی سەخت دەست پێدەکات، تەمەنی تەنها حەوت ساڵە، نە دایکی لە ژیاندا ماوە، نە باوک، ئیدی شێخی سەعدی بەبێ باوکو دایک گەورە بوو، دوور لە نازی دایکو بە دەر لە ئامێزی باوکی ژیانی منداڵیو هەرزەکاری گوزەراند، مردنی دایکو باوکی، نەبووە هۆی بەلارێدا ڕۆیشتنی شێخی سەعدی، بەڵکو لەسەر جوانترین پەروەردەو باشترین ئاکارو ڕەفتار گەورەبوو، هەر لەسەرەتای تەمەنییەوە بە زیرەکیو بیرتیژیو حەزو ئارەزووی بۆ خوێندنو زانستو زانیاری بەدەرکەوت.

شێخی سەعدی دوای کۆچی دوایی باوکی دەستیکرد بە خوێندنی قورئانی پیرۆز، کاتێك تەمەنی گەیشتە یانزە ساڵ، تەواوی قورئانی پیرۆزی لەبەرکرد، پاشان خۆی سەرقاڵ کرد بە خوێندنو فێربوونی زانستو زانیاری، لەلای گەورە زانایانی سەردەمی خۆی، دوای تێکۆشانو هەوڵدانو ماندووبوون بۆ فێربونی زانستو زانیاری، توانی سەرجەمی هونەرەکانی زانستی شەرعی فێرببێت، کاتێك تەمەنی گەیشتە ٢٣ ساڵ، بووە مامۆستاو وانەی دەگوتەوەو لە هەمان کات وانەشی دەخوێند، شێخی سەعدی هەموو کاتەکانی تەمەنی لە فێرکردنو فێربوونی زانستدا بەسەر بردووە، تەواوی خوێندکارەکانی پشتیان بە شێخی سەعدی دەبەست لە فێربونی زانستدا.

هەندێك لە مامۆستاکانی شێخی سەعدی:

یەکێك لە مامۆستاکانی شێخی سەعدی کە زانستی لێوەرگرتووە، (شێخ ئیبراهیمی کوڕی حەمەدی کوڕی جاسر)ە، ئەو یەکەم کەس بوو قورئانی پیرۆزی لەلاخوێند، شێخی سەعدی ئەم مامۆستایەی بە مامۆستای فەرمووده وەسف کردووە، مامۆستای بە دونیا نەویستو خودناسو خۆشەویستی بۆ هەژارانو بەدەمەوەچوونیانو جێبەجێکردنی پێداویستیەکانیان وەسف کردووە، لەگەڵ ئەوەشدا لە ڕووی داراییەوە کەسێکی دەستکورت بووە..

یەکێکی دیکە لە مامۆستاکانی شێخی سەعدی، (محمدی کوڕی عبدالکریمی شەبل)ە، وانەکانی فیقهو زانستی زمانی عەرەبیو چەند وانەیەکی دیکەی لە لاخوێندووە.. یەکێکی دیکە لە مامۆستاکانی (صاڵحی کوڕی عوسمانی قازیی)ە، وانەکانی یەکتاپەرستیو ڕاڤەی قورئانو فیقهو ئوصولو لقەکانیو زانستی عەرەبی لەلا خوێندووە، لە هەمووان زیاتر لای ئەم مامۆستایە خوێندوویەتیو پەیوەست بووە پێوەی، تا ئەو ساتەی ماڵاوایی لە ژیان کردووە، هەروەها لای ئەم مامۆستا بەڕێزانەش زانستی فەرموودەی خوێندووە:- (عبدالله کوڕی عایض، شێخ صعب تویجری، شێخ علی سنانی سخی علی ناصر ئەبووادی)، هەروەها ئیجازەی لەسەر دەستی ئەم مامۆستایانەش وەرگرتووە، (شێخ محمد کوڕی شێخ عبدالعزیز، محمد المائع کە ئەو کات بەڕێوەبەری ڕۆشنبیری بوو لە وڵاتی سعودیە)، هەروەها لای شێخ محمد شەنقیتی زانستی تەفسیرو زانستی فەرموودەو زانستی عەرەبی خوێندووە، وەکو نەحو صەرفو هاوشێوەکانی.

کورتەیەك لە ئاکارە بەرزەکانی شێخی سەعدی:

یەکێك لە لایەنە گەورەکانی شێخی سەعدی ئاکارو ڕەوشتی جوانو ناوازەیەتی، سەعدی لەگەڵ گەورەو بچووك، دەسەڵاتدارو بێ دەسەڵات، دەوڵەمەندو هەژاردا، کەسێکی خاکیو خۆبەکمزان بووە، شێخی سەعدی هەندێك لە کاتەکانی لە کۆبوونەوە لەگەڵ ئەو کەسانەدا بەسەر دەبرد کە حەزیان بە دانیشتن بوو لەگەڵیدا، دانیشتنەکەی بۆ دەکردنە کۆڕی زانستو زانیاری، هەمیشە کۆڕەکانی پێکهاتبون لە توێژینەوەی زانستیو باسو خواسی کۆمەڵایەتی، بەشێوەیەك کە سوودی زۆری بە ئامادەبووان دەگەیاند، شێخی سەعدی ڕێڕەوی دانیشتنە ئاساییەکانی دەگۆڕی بۆ دانیشتنی خوداپەرستیو کۆڕی زانستی، لەگەڵ هەموو کەسێك قسەی دەکرد، بابەتە بە سوودەکانی دنیاو دوارۆژی تاوتوێ دەکرد، هەمیشە چارەسەری کێشەو گرفتەکانی خەڵکی بەشێوەیەك دەکرد، کە هەردوولا پێی ڕازی بن، دادپەروەرو حەق بێژ بوو، زۆر بەسۆزو بەبەزەیی بوو لەگەڵ هەژارانو نەدارانو ڕێبواران، هەموو کات بەپێی توانای خۆی، دەستی یارمەتی بۆ درێژ دەکردن، ئەو وەکو نەریتی هەمیشەیی خۆی هاودەمی چاکەکارانی دەکرد، لە هەموو بۆنە خێرخوازییەکاندا

بەشداری دەکرد، لایەنێکی دیکەی ئاکاری بەرزی شێخی سەعدی، ئەدەبی بەرزو داوێنی پاکو دەستپاکو دەروونپاکو سووربوونی بوو، لەسەر هەموو کارێکی باش، لە کەسە چاکەکان بوو، بە زانستو زانیاریو کردەوەی چاک پێشەنگی خەڵکی بوو، کەسێکی تێگەیشتوو پێگەیشتوو بوو، کاتەکانی بۆ فێرکردن زۆر جوان ڕێکخستبوو، کاری دەکرد بۆ مشتومڕو گفتوگۆی زانستیانە لە نێوان قوتابییەکانیدا، بۆ تیژکردنو بەهێزکردنی بیرو زیهنیان، هەوڵی دەدا قوتابییەکانی بیرو هزریان بخەنە کارو بە دوای زانستدا بگەڕێن، کۆششی دەکرد بۆئەوەی زانست لای خوێندکارەکانی خۆشەویست بکات! هەرکەسێك متونێکی لەبەربکردایە، خەڵاتی دەکرد، لەگەڵ ئەوەشدا هەرگیز هیچ کام لە قوتابییەکانی لە دیارییەکانی بێبەش نەدەکرد.

قوتابییەکانی هەمیشە ڕاوێژیان پێدەکرد بۆ هەڵبژاردنی بەسوودترین کتێب بۆ خوێندن، ئەوان هیچ کات لە دانیشتنو وانەکانی شێخی سەعدی بێزارو ماندوو نەدەبوون، چونکە تاموو چێژیان لە دانیشتنەکانی دەبینی، هەر ئەو هۆکارە بوو وایکردبوو، کە قوتابی گەلێکی زۆری هەبوو، وانەیان لەسەر دەستی دەخوێند.

**زانستی شێخی سەعدی:**

شێخی سەعدی شارەزای تەواوی زانستی فیقهو ئوصولو بەشەکانی بوو، لە سەرەتای ژیانیدا بووە یەکێك لە شوێنکەوتووانی مەزهەبی حەنبەلی، چونکە مامۆستاکانی شوێنکەوتووی مەزهەبی حەنبەلی بوون، هەندێك لە متوونەکانی مەزهەبی حەنبەلی لەبەرکرد، سەرەتا موسەنیفێکی لە فیقهی حەنبەلی دانا، چوار سەد دێڕ بەیتی بە شێوەی شیعر ڕێکخستبوو، کە بەشێوەیەکی کورت شەرحی کردبوو، بەڵام دوای دەرکەوتنو پێگەیشتنی حەزی بە مەزهەبی حەنبەلیو تەعەصوبی مەزهەبی نەما، ئیدی خۆی سەرقاڵ کرد بە کتێبو دانراوەکانی شێخی ئیسلام ئیبنو تەیمییەو قوتابییەکەی ئیبنو قەیمی جەوزیی، زۆر سوودی لێبینین، لە زانستی ئوصولو یەکتاپەرستیو تەفسیرو فیقهو چەندین زانستی دیکە لە زانستە بەسوودەکان، لەبەر ڕۆشنایی کتێبەکانی هەر دوو شێخان (ئیبنو تەیمیەو ئەیبین جەوزی) پەیوەست نەما بە مەزهەبی حەنبەلییەوە، بەڵکو تەرجیحی هەر شتێکی دەکرد، کە بەڵگەی شەرعی ڕاستو درووستی لەسەر بووایە، لە ئەدەبی شێخی سەعدی ئەوەبوو کە هەرگیز توانجی لە زانایانی مەزهەبەکان نەدەدا، ویردی سەرزاری هەمیشە دەیگوت: خودا ئێمەشو ئەوانیش ڕێنموونی بکات، بۆ ڕێگای ڕاستو درووستو ڕۆشن.

شێخی سەعدی لە زانستی تەفسیردا کەسێکی لێهاتوو بوو، چەندین تەفسیری دەخوێندەوەو لێهاتووانە لە مەبەستو ناوەرۆکیان تێدەگەیشت، تەفسیرێکی ناوازەشی لە چەند بەرگێکدا دانا، کە بەشێوەیەکی ئاشکراو روون ڕاڤەی کردووە، بێئەوەی کاتی پۆلێنکردنو پاکنووسکردنی تەفسیرو کتێبەکانی هەبێت.. هەمیشە بۆ قوتابییەکانی بەلەبەر قورئانی بۆ دەخوێندنو تەفسیری بۆ دەکردن، سوودو واتاو مەبەستەکانی قورئانی، بەشێوەیەکی زۆر جوان لێك دەدایەوە، واتاو مەبەستەکانی قورئانی هەڵدەهێنجا، بەشێوەیەك کە گوێگرانو ئامادەبووان لە کاتی دارشتنی چیرۆکەکانو تەفسیرو ڕاڤەی ئایەتەکاندا، بێدەنگو بێ چپە دەبوونو سەرسام دەبوون بە ڕەوانبێژیو زۆری زانستەکەیو فراوانیو جوانی دەربڕینەکانی، هەر کەس لەگەڵیدا دابنیشتایەو گوێی بۆ وانەکانی بگرتایە، دەیزانی کە شێخی سەعدی چەندە بە تواناو خاوەن زانستە، هەروەها هەر کەس کتێبو دانراوەکانو فەتواکانی بخوێندایەتەوە، بە هەمان شێوە لێهاتوویی شێخی سەعدی بۆ دەردەکەوت.

**دانراوەکانی شێخی سەعدی:**

* تەفسیری قورئانی پیرۆز بە ناونیشانی (تیسیر الکریم المنان) لە هەشت بەرگدا لە ساڵی ١٣٤٤ تەواوی کرد.

(ارشاد اولی البصائر والالباب) بۆ شارەزابوون لە فیقهـ، بە نزیکترین ڕێگەو ئاسانترین هۆکار، کە لەسەر شێوەی پرسیارو وەڵام دایرشتووە، لە چاپخانەی ترقی لە دیمەشق ساڵی ١٣٦٥ چاپکراوەو بە دیاری بەخشراوە.

* (الدره المختصره فی محاسن الاسلام).

* (الخطب العصریه القیمة). کە پێکهاتبوو لە کۆمەڵێك وتاری زۆر بەهێز، بۆ وتاری هەینیو جەژنەکانو هەموو ئەو شتانەی لەگەڵ ئەو کاتەدا دەگونجاو پێویستی خەڵکی بوو. ئەم کتێبەشی لەگەڵ (الدرة المختصرة) چاپ کرد، بەبێ بەرامبەر، واتە بە دیاری بەخشیو بڵاوی کردەوە.

* (القواعد الحسان لتفسیر القران)، ساڵی ١٣٦٦ چاپ کراو ئەم کتێبەشی بە دیاری بەخشیو بێ بەرامبەر بڵاوی کردەوە.

* (تنزیه الدین وحملته ورجاله)، ساڵی ١٣٦٦چاپ کرا.

* (الحق الواضح المبین، فی شرح توحید الانبیاء والمرسلین).

* (توضیح الکافیه الشافیة، وهو کالشرح لنونیه الشیخ ابن القیم).

* (الوسائل المفیدة للحیاة السعیدة)، لە چاپخانەی قاهیرە لەسەر ئەرکی خۆی چاپکراو بە دیاری بەخشرا.

* (القول السدید فی مقاصد التوحید)، ساڵی ١٣٦٧ لە میسر چاپکرا.

* (مختصر فی اصول الفقه).

* (تیسیر اللطیف المنان فی خلاصة تفسیر القران).

* (الریاض الناضرة).

**مەبەستی شێخی سەعدی لە دانراوەکانی:**

مەبەستی شێخی سەعدی لە دانراوەکانی، تەنها بڵاوکردنەوەی زانستو بانگەواز بووە، بۆ ڕێگەی حەقو ڕاستی، هەر لەبەر ئەم هۆکارە بووە سەرجەم ئەو بەرهەمانەی لەسەرەوە ئاماژەمان پێکردووە بە چاپ گەیاندووە، زۆرێك لە دانراوەکانی بە دیاری بەخشیوەو بێ بەرامبەر دابەشی کردووە، بێئەوەی هیچ قازانجێکی ماددی لێ بکات!

**کۆچی دوایی شێخ عبدالرحمن السعدی:**

لە ساڵی ١٣٧٦ کۆچی، لە تەمەنی ٦٩ ساڵیدا، لە شارۆچکەی عەنیزە سەر بەناوچەی قەصیم، کۆچی دوایی کردووەو بۆ هەمیشە ماڵاوایی لە ژیان کردووە.

ئەگەرچی شێخی سەعدی خۆی کۆچی دوایی کردووە، بەڵام بەرهەمو دانراوەکانیو زانستو زانیارییەکەی، بۆ هەمیشە دەمێنێو خزمەت بە ڕێبوارانی ڕێگەی حەقو ڕاستی دەکات!

**بە کورتی:** شێخی سەعدی، زاناو ناودارو عەلامەو موفەسیرێکی لێهاتوو بوو، ئەو داوای زانستو زانیاری کرد، دەستی کەوت، تەواوی قورئانی پیرۆزو مەتنەکانی لەبەرکردووە، شێخ ناووناوبانگی دەرکردو ماڵەکەی قەرەباڵغ بوو، قوتابی گەلی زۆری هەبوو، چەندین کتێبی بەسوودی دوای خۆی جێهێشتووە، کە زۆربەیان سەبارەت بە تەفسیری قورئانی پیرۆزو زانستی قورئان بوون، شێخ یەکێك بوو لە بەناوبانگترین زاناکانی سەردەمی خۆی، لە ڕووی زانستو ئاکاری جوانو بەرهەمو دانراوەکانییەوە.

# تۆ لای خۆتەوە ژینگە پارێز بە!

جەلال عەبدوڵا حاجی



کێشـە ژینگەییەکان لەخۆڕا درووسـت نابـن، بەڵکو هۆکاری ئابوری، سیاسی، تەکنەلۆجی و ئەخلاقـی، دەبنە هۆی ڕوودانی کێشـەکە، بۆیە دەبینین لەو وڵاتو هەرێمانەی باری ئابوورییان خراپە، شەڕوو ئاژاوەی تێدایە، ژینگەی ناوچەکە لە حاڵێکی زۆر خراپدایە، لەلایەکی ترەوە، هەندێك وڵات لە ڕووی ئابوورییەوە بەهێـزن، شـەڕو ئاژاوە لـە ناوچەکەشـدا نییە، بـەڵام بەهۆی سوودوەرگرتنی زۆر لە ئامێرو هەبوونی کارگەیەکی زۆر، ژینگەی ناوچەکـە لە مەترسـیدایە، ئـەوەی گرنگە ئامـاژەی پێبکەین، ئـەو بەرپرسـیاریە ئەخلاقیەیـە، کە تـاك هەیەتـی بەرامبەر ژینگـە، ئەمەش لـە ڕێگەی پـەروەردەی ژینگەییەوە دەبێت، کە لـە هەموویان گرنگترە، چونکە لەم ڕێگەیەوە دەتوانین ئاسـتی هۆشـیاری تاك بەرز بکەینـەوە بەرامبەر ژینگەکـەی، هەروەها هانـی حەزو تواناکانیان بدەین بۆ یارمەتی دانی ژینگەو کێشـە ژینگەییـەکان، لـە ڕێگـەی پێدانی زانیـاری؛ بۆئـەوەی بتوانن کاری تاکەکەسـیو بە کۆمەڵ بکەن، بۆ چارەسـەرکردنی کێشـە ژینگەییەکانی ئێستاو دوورخستنەوەی کێشەی نوێ.

ڕۆژی ژینگەی هەرێم دەکەوێتە (١٦- ٤)ەوە، لەم ڕۆژەدا گرنگی دەدرێـت بە خاوێنکردنـەوەی ژینگە، بەرپرسـانی حزبو حکومی تێیدا بەشدار دەبن، لەلایەن کەناڵەکانیشەوە ڕوومالْ دەکرێت، تێیدا هەڵدەسـتن بە ڕواندنی نەمامو خاوێنکردنەوەی کۆڵانەکان لە خۆڵو خاشاك، ئەوەی پێویستە لەو ڕۆژەدا ئاماژەی پێ بکرێت:

**یەکـەم:** ژینگـە دەبێـت هەموو ڕۆژێـك گرنگـی پێبدەین، ماڵـەوە، کۆڵانو گـەڕەك، تەنانەت شـوێنی کارکردنمان، دەبێت بـەردەوام خاوێن بکرێتەوە، ڕاسـتە هۆشـیارکردنەوەی خەڵکی بە گرنگیدان بە سـەوزایی کارێکی باشـە، بەڵام پاراستنی ژینگە زۆر لـەوە گـەورەو فراوانترە، بۆیە ئـەم ڕۆژە نابێت بەتەنیا لە هەڵمەتی خاوێنکردنەوەدا کورت بکرێتەوە، ڕەنگە بەشـێکی ئەم کارە بگەڕێتـەوە بۆ نەبوونی پلان، لەلایەن ڕێکخراوەکانی بواری ژینگـەوە؛ بۆئەوەی لـەم ڕۆژەدا بیخەنە ڕوو، چۆن چارەسـەری گرفتو کێشـە ژینگەییەکان بکەن؟ ئایـا توانیویانە هەماهەنگی بکەن لەگەڵ وەزارەتەکاندا؟ چۆن سوود لە توانای کەسانی پسپۆڕ وەربگـرن لەم بوارەدا؟ ئایا خەونو ئاواتـی ئەوان چییە؟ پلانی واقیعیـان هەیە؟ تاچەند دەتوانن یارمەتی شـارو شـارۆچکەکان بدەن بۆ چارەسەرکردنی کێشەی ئاوی خواردنەوە، ئاوەڕۆ، شوێنی خۆڵو خاشـاك؟ تاچەند توانیویانە کەسـی خۆبەخش لە خۆیان کۆبکەنەوە؟

**دووەم:** ئەوەی گرفتی ژینگەپارێزی لە هەرێمدا قورستر دەکات، نەبوونی دیدگایەکی ڕوونە، لەلایەن زانکۆکانەوە، ئایا ئەو توێژینەوە زانسـتیانەی کـە ئەنجام دەدرێـن، چەندیان لـە خزمەت ژینگەی ناوچەکەدان، لە ڕووی چارەسـەرکردنیو گرفـتو ڕێگریکردن، لە ڕوودانی کارەسـاتە ژینگەییەکان، لە ئێسـتاو داهاتوودا، لە ڕاستیدا دەبێـت ئەم خاڵە بەهەند وەربگیرێت، بەتایبەت لەلایەن وەزارەتی خوێندنی باڵاو توێژینەوەی زانسـتییەوە، بکرێت بە مەرج دەبێت توێژینـەوەکان لە خزمەت ژینگەی ناوچەکەدا بێت، کەشو هەوای ناوچەکـە بۆ گـۆڕاوە؟، دیارنەمانـی جۆرێکی تایبەت لە ماسی، باڵنـدە، مێرووی سـوودبەخش؟ زۆربوونی جۆرێـك لە گیانەوەر؟ پیسـبوونی ئاوی ژێر زەوی؟ کاریگەری ژاوەژاو؟ کاریگەری شـەڕو گۆڕانە سیاسـییەکان لەسـەر تاکی ئەم هەرێمە؟ دەرهێنانی نەوت، گازو کانـزاکاری؟ ..هتد، لـە هەمان کاتدا وەزارەتـی پەیوەندیدار سـوود لە توێژینەوەکان وەربگرێت، بە مەبەسـتی کەمکردنەوەی سەرچاوەکانی پیسبوون.

**سێیەم:** لە بواری پەروەردەدا تارادەیەك گرنگیدان بە ژینگەو گرفتە ژینگەییەکان زیادی کردووە، بەڵام لە ئاستی پێویستدا نییە، ئەوەی نیگەرانییەکان زیاتر دەکات، دابڕانی منداڵانی ئەم هەرێمەیە لـە ژیانی گوندو بە تیۆری بوونی هەمـوو بابەتەکانە، تەنانەت زانیاریان زۆر کەمە لەسەر گرنگی سەرچاوەکانی بژێوی داهات، هەروەها دابڕان لە زمانو کەلتوری ڕەسەن، منداڵان بەشی زۆریان نامـۆن بە ئاژەڵو باڵنـدەو گیانلەبەران، وڵاتە پێشـکەوتووەکان لە زووەوە درکیان بەم بابەتە کردووە، هەربۆیە سـاڵانە گەشـتی تایبەتی ڕێکدەخەن بۆ منداڵان، بۆ گوندو کێڵگەکانی بەخێوکردنی مانگاو پەلەوەر، بەدەسـت لێدانو دۆشـینو کۆکردنەوەی هێلکە، کاتێك شیرەکە دەخواتەوە دەزانێت لەکوێوە دێت، دەبێت ژینگەی گیانلەبەرەکە خاوێن بێت؛ بۆئەوەی شیرێکی خاوێن بخواتەوە، لە ڕێگەی گەشـتو وانەی پراکتیکیەوە گرفتە ژینگەییەکان پیشانی منـاڵ دەدەن، وا لـە منالْ دەکەن بیر لە چارەسـەر بکاتەوە، بە سوودوەرگرتن لە سەرچاوەی وزەی خاوێن، هەروەها قوتابخانەی تایبەتیان هەیە بە ژینگەپارێزیو سەوز ڕاگرتنی ژینگە..

تۆ لای خۆتەوە ژینگە پارێز بە، کۆمەڵگە چاوی لەدەستی کەسـە دڵسـۆزەکانە، بەڵام نەوەی داهاتوو چاوی لەدەسـتی ژینگە پارێزەکانە..

# بۆ گەورەترین داهێنانی تەکنەلۆژی!



## ستیف جۆبز
## 1955 -2011




ئالانی

**هیچ کـەس لەوبڕوایەدا نەبوو، منداڵێکـی بێ باوكو دایك، شۆڕشێکی ئەلکترۆنی لەسەر ئاستی جیهان بەرپا بکات!**

سـتیف جۆبز، بەڕەگەز سـووریيە، لە ٢٤ شوباتی ساڵی ١٩٥٥ لە ویلایەتـی کالیفۆرنیا لە دایکبووە، دوای مردنی باوكو دایکی ئەم خێزانـە (کلارا جۆبزو پول) دەیکەنە کوڕی خۆیانو ئەرکی بەخێوکردنو سەرپەرشتیکردنو پەروەردەکردنی دەگرنە ئەستۆ،

سـتیف جۆبـز تەنها بێ بـاوك نەبووە، بەڵکـو بێ دایکیش بووە، بەڵام ئەم کارەسـاتە سەختە نەبووەتە هۆی سەرنەکەوتنو دەرنەکەوتنی جۆبز لە دونیای تەکنەلۆژیادا.. جۆبز لە سـەرەتای شەسـتەکاندا گەورەبوو، هەڵسـوکەوتو ئـاکاری تاڕادەیەکی زۆر کاریگـەری ئـەو بارودۆخەی پێـوە دیار بووە، کـە تیایدا ژیاوە تەمەنـی لاوی جۆبـز، لێـوان لێو بووە لە حـەزو خولیاو هیواو ئاواتو هۆگربوونی بە ئەلکترۆنیاتەوە.

جۆبز لە تەمەنی سـیانزە سـاڵیداو لە پشـووی هاویندا، بۆ کارکردنو پەرەپێـدان بە خولیاکانی لـە کۆمپانیای بەناوبانگی (Hewlett Packard) ناسـراو بە (HP) دەستی بە کارکردن کرد.

ئەو ژینگەیەی سـتیف جۆبزی تێدا ژیـاوە، کاریگەری زۆری لەسەر خەونەکانیو کەسایەتی هەبووە، کە دەرەنجام ئەنجامەکەی بەدیهێنانی خولیاو ئاواتەکانی لێکەوتەوە.

سـتیف جۆبز نەی دەتونـی لە منداڵانـی هاوتەمەنی خۆی تێبگات، چونکە ئەو حەزی دەکرد بەردەوام کاربکات بۆ هێنانەدی ئاواتەکانی، نەیدەتوانی وەکو منداڵێکی ئاسایی، ژیان بگوزەرێنێت، ئەم هەڵسوکەوتەشی زۆر ماندووی دەکرد..

ستیف جۆبز، کاتێك گەیشتە قۆناغی ناوەندی، حەزی دەکرد تێکەڵاوی ئەو کەسـانە بێت کە تەمەنیان لە خۆی گەورەترە، کە یەکێك لە هاوڕێکانی ناوی (سـتیف وزنیاك) بوو چوار سـاڵ لە خۆی گەوەرەتر بوو، کـە دواتر لەگەڵ جۆبز کۆمپانیای ئەپڵیان دامەزراند..

جۆبز زۆر حەزی بە ئەلکترۆنیات دەکرد، لە خۆشیدا نقووم بوو، کاتێك لەگەڵ وزنیاکی هاوڕێی دیزانی (العلبة الزرقاء)ی کرد، کـە یارمەتی دابەزاندنی رسـوماتی پەیوەندییە تەلەفۆنییەکانی دوور وڵاتـی دەدا، کە لەگەڵ وزنیاك پێکەوە دیزانی ئەم کارەیان کرد، دواتریش داهێنانەکەیان فرۆشت.

دوای تەواوکردنـی خوێندنـی ئامادەیـی، جۆبـز پەیوەندی کـرد بە زانکۆی (رييد) لە شـاری ئوریجن، بەڵام ئەوەی جێگەی سەرسـوڕمان بـوو، ئەوەبوو کە ئەم بلیمەتـە نەیتوانی لە زانکۆ سـەرکەوتوو بێت، هۆگریو سـەرقاڵیی بە ئەلکترۆنیاتەوە، بووە هـۆی سـەرنەکەوتنی لە زانکۆ، بـەڵام هەر کەس لـە خوێندن سـەرنەکەوت مانای ئـەوە نییە کەسـێکی شکسـتخواردووە، بە پێچەوانەوە ژیان لە سـەدان لایەنو هۆکار پێکهاتووە، گەر مرۆڤ نەیتوانی لە لایەنێك سـەرکەوتوو بێت، دەیان ڕێگای دیکە هەیە تا تواناکانی خۆی تێدا بخاتە گەڕو سەرکەوتن بەدەست بهێنێت..

جۆبـز وازی لـە خوێندن هێنا! (جیاوازییـەك لە نێوان ئەو سـەرکەوتووانەو ئێمـەدا، هێزی بڕیاردانە، سـەرنج بدە، کاتێك جۆبز لە خوێندن سـەرکەوتوو نەبوو، دەستەو ئەژنۆ دانەنیشتو خەم لە ئامێز بگرێت، یاخود بە زۆر خۆی بسـەپێنێت بەسـەر بارودۆخەکـەداو خۆی ناچار بکات، هـەر چۆنێك بێت خۆی بە کارێکەوە سەرقاڵ بکات، کە خولیاو حەزەکانی تێدا بەدی ناکات، جۆبز زۆر باش دەیزانی تواناکانی لە شوێنێکی دیکەو لە بوارێکی دیکەدا بەهێزەو دەتوانێت لەو لایەنەوە هەوڵی سەرکەوتن بدات، هەربۆیـە بوێرانە بڕیاری داو ڕووی کردە جیهانی ئەلکترۆنیات)، ئێستا با پێکەوە سەرەنجامی ئەم بڕیارەی جۆبز بخوێنینەوە..

جۆبـز وازی لە خوێندن هێناو پەیوەندی کرد بە کۆمپانیای (ئەتاری)یەوە؛ بۆئەوەی بە دوای ئایندەو هێنانەدی خەونەکانیدا بگەڕێت.

جۆبز لەم کۆمپانیایەدا تواناکانی خۆی وەگەڕخستو دیزاینی بـۆ چەندیـن جۆری یاری ئەتـاری کرد، بە جۆرێـك کە جیهان بـە دیزاینەکانی سەرسـام بوو، جۆبز لە داهێنـانو پەرەپێدانی خولیاو ئاواتەکانی بەردەوام بوو، وەکو زۆرینەمان بە زیادکردنی

مووچەو داهاتی زیاترو ئەو شـتانە، بەردەوامی نەدا بە کارکردن لـە کۆمپانیاکـەدا، بەڵکـو بیری لـە داهێنانی زیاتـرو پرۆژەی سەربەخۆو گەورەتر کردەوە.

جۆبز لە تەمەنی بیستو یەك ساڵیدا درووست لە (١|٤|١٩٧٦) لەگەڵ (وزنیـاك)ی هاوڕێیدا، کۆمپانیـای (ئەپڵ)یان دامەزراند، سەرەتای دامەزراندنی کۆمپانیای ئەپڵ، دووچاری قەیرانی دارایی بوون، بـەڵام قەیرانی دارایـیو نەبوونی بودجەی پێویسـت بۆ ڕێبەرێکردنی کارەکانیان، شکسـتی پێ نەهێنان، سەرەتا هەردوو ئۆتۆمبێلەکـەی خۆیو هاوڕێکەشـی فرۆشـت، بـۆ پڕکردنەوەی داهاتو خەرجی کۆمپانیاکەیانو ڕاپەڕاندنی کارەکانیان، تەنها بۆ بەدەستهێنانی ١٣٠٠ دۆلار بۆئەوەی یەکەم ئامێری ئەپڵ درووست بکەن!

جۆبـزو وزنیاك بڕیاریان دا، دیزاینی ئەپڵ بفرۆشـن، بەڵام لە سـەرەتادا کەس بڕوای بەو ئامێرە نەبـوو، لەبەرئەوە جۆبز بڕیاری دا کە ئەو دیزاینە بە کەس نەفرۆشێت!

جۆبـز گەڕاجـی ماڵەکـەی کردبـووە، وەرشـەی کارکردن، ژوورەکەی کردبووە گەنجینەی کارەکانی، ژووری دانیشتنەکەشـی کردبووە شـوێنی هەڵگرتنو بەتاڵکردنەوە.. هەرچەندە ماڵەکەش هی خۆی نەبوو، بەڵکو هی ئەو خێزانە بوو کە هەڵیانگرتبووەوەو کردبوویانـە منداڵی خۆیان، جۆبز ماڵەکەی کردبووە کارگەیەکی بچووك، خێزانەکەشی نەك ڕێگەیان لێ نەدەگرت، بەڵکو هاندەرو هاوکاری بوون بۆ هێنانەدی خەونەکانی..

لە کۆتایـی حەفتاندا جۆبزو وزنیاك دووچـاری قەیرانێکی گـەورەی دارایی گەورە بوون، بەشـێوەیەك زۆرێـك لە خەڵکیو بەتایبـەت ڕکابەرەکانیـان، لـەو باوەڕەدابـوون شکسـت بهێنن، ڕووبـەڕووی ڕەخنەی توند بوونەوە، بەڵام هەموو ئەو بارودۆخە بـۆ چرکەیەکیش چۆکی پێدانـەدان، بەڵکو بـەردەوام بوون لە پەرەپێـدانو باشـترکردنی دیزاینـی ئامێرەکەیان، لـە کاتێکدا خەڵکـی لەو باوەڕەدابـوون کە بازاڕێك نییە بۆ سـاغکردنەوەی کۆمپیوتەرەکەیـان، تەنانەت گـەورە کۆمپانیایەکی وەکو (انتیل) پێـی وابوو کـە بوارێك، یاخود بازاڕێك نییە بۆ سـاغکردنەوەی کۆمپیوتـەری تایبەتی، لەو کاتـەدا (microprocessor)یان داهێنـا، کۆمپانیاکـە نەیدەزانی کە ئەو داهێنانـە دەبێتە هۆی داهێنانی کۆمپیوتەری لاپتـۆپو دەبێتە کۆمپیوتەرێکی خوازراو لای هەمووان!

هەموو گەورە کۆمپانیـاکان بیرۆکەی (ئەپڵ)یان ڕەتکردەوە، کەسیان ئامادە نەبوون داهێنانو دیزاینەکانی ئەپڵ بکڕن!

بـەڵام ئەم ڕەتکردنەوەیـە خەونەکانی ئەم دو لاوەی لە گۆڕ نەنا، بەڵکو بیریان لە جێگەیەك کردەوە، کە بیرۆکەی شـارەزاو پسـپۆڕانو کۆمپانیاکانی پێ نەگەیشتبێت! ئەوان قسەی خەڵکیو ڕەخنەی کۆمپانیاکانو شارەزایان هیچ ساردی نەکردنەوەو گوێیان پـێ نەدا، بەڵکو بەردەوام بـوون لە داهێنانی زیاترو پەرەپێدانی ئامێرەکەیان.

جۆبـز بە بیرۆکـە تیژەکانی بەردەوام بوو، تا ئەو سـاتەی جیهانی لە ڕووی ئامێرەکانی کۆمپیوتەرەوە گۆڕیو بووە خاوەنی ملیارات دۆلار!

ئەو سـاتەی ئەپڵ توانی (١٣٠٠٠) ئامێر بفرۆشـێت، ئیرادەی بەهێزی جۆبز، بە هەمووانی سـەلماند، کـە ئەوان لە هەڵەدان، ئیدی ئەپڵ دەستی بەسەر جیهانی کۆمپیوتەردا گرت!

بەرهەمەکانی ئەپڵ لە ساڵی ١٩٩٢ گەیشتە حەوت ملیار دۆلار، ئەمە بەرهەمی ئەو دوو کەسـە بوو، کـە یەکێکیان بە بێباوکی گەورەبـوو، جگە لە شـەش مانـگ ئەزموونی کارکـردن لەگەڵ کۆمپانیای ئەتاری، هیچ پێشینەیەکی دیکەی نەبوو، هاوڕێکەشی وزنیـاك وازی لە زانکـۆ هێنابوو؛ بۆئەوەی هاسـەرگیری بکات.. وەکو کارمەند لە کۆمپانیای (HP) کاری کردووە، ئەوان تەنانەت لە بەڕێوەبردنیشـدا هیچ ئەزموونێکیان نەبـوو، کاتێك ئەپڵیان دامەزراند، لەگەڵ هەموو ئەو قەیرانە داراییەدا، قسـەو ڕەخنەی ڕووخێنـەری، زۆریـان ڕووبـەڕوو بووەوە! بـەڵام نەیانتوانی لە خەونەکانیان، ساردیان بکەنەوە.

جوبز لە داهێنانو پەرەپێدانو بەرەوپێشـبردنی کارەکانیدا بـەردەوام بوو، تا بووە ئەو کەسـە بەناوبانـگو داهێنەرەی کە چەندین ڕۆژنامەو گۆڤاری (INC) بە کەسایەتی ساڵانی (١٩٨٠ تا ١٩٩٠)ی ئەمریکا دیاریکرا.

### خەڵاتەکانی جۆبز:-

جۆبـز.. چەندەهـا خەڵاتی بەدەسـتهێنا، لەوانـە خەڵاتی (جیفرسـون) بـۆ خزمەتگوزاری گشـتی، سـاڵی ١٩٨٧، هەروەها خەڵاتـی کۆمپانیـای (INC) سـاڵی ١٩٨٩، هەروەهـا مەدالیـای نیشتمانی بەدەستهێنا..

هەموو ئەمانەش بە هۆی ئەو شۆڕشـە کۆمپیوتەرییەوە بوو، کە جیهای شڵەقاند..

### داهێنانەکانی جۆبز:-

* داهێنانی ئامێری ماکن تووش، بە هەموو جۆرەکانییەوە..
* جۆبـز تەنهـا لە جیهانـی کۆمپیوتەردا نەوەسـتا، بەڵکو داهێنانەکانی بەرەوپێشـتر برد، تا ئەو سـاتەی توانی ئامێرێکی وەکـو (ئایفۆن) دابهێنێت، کاتێك جۆبـز داهێنانی ئەم ئامێرەی ڕاگەیاند وتی: (ئێمە جارێکی دیکە تەلەفۆنمان داهێنایەوە)..
* بە بڕوای جۆبز هێشـتا خەونو خولیاکان تەواو نەبوون، داهێنانـەکان سـنوریان بۆ نییـە، لەبەرئەوە بـەردەوام بوو لە داهێنـان، تا ئەو سـاتەی ئامێری (ئایپاد)ی داهێنـا، کە گۆڤاری (تایم) بە گرنگترین داهێنانەکانی ساڵی ٢٠١٠ هەژماری کردووە.
* (ئایپۆد)یش یەکێکی دیکەیە لە داهێنانەکانی جۆبز.

- بە داخەوە ستیف جۆبز لە ساڵی ٢٠٠٤ دووچاری نەخۆشیی شێرپەنجەی پەنکریاس بوو، لە ساڵی ٢٠٠٩ نەشتەرگەری چاندنی جگەریـان بـۆ ئەنجام دا، بەڵام ئەو نەخۆشـییەش لـە داهێنان نەیوەستاند، بەڵکو زۆرێك لە داهێنانەکانی وەکو (ئایپادو ئایفۆن) دوای تووشبوونی بەو نەخۆشییە داهێنا..

دوای ململانێییەکی سـەخت لەگەڵ نەخۆشییەکەیدا، دواجار لـە ئۆکتۆبەری لە ٢٠١١/١٠/٥ لە تەمەنی پەنجاو شـەش سـاڵیدا، دوای شـەش هەفتـە لە دەستەلکارکێشـانەوەی لـە بەڕێوەبەری جێبەجێـکاری کۆمپانیای ئەپڵ، ئەم داهێنـەرە مەزنە، ماڵاوایی لە ژیان کرد..

لە وتـە بەناوبانگەکانی جۆبز (پرسـیاری ئـەوە مەکە، کە بریـکارو کرپارەکەت، لە ئێسـتادا چی دەوێت، بەڵکو بپرسـە لە ئاییندەدا ئارەزووی چی دەکاتو خەون بە چییەوە دەبینێت)!

لە سـتیف جۆبزیـان پرسـی: بۆچـی کۆمپانیاکـەت ناونا (Apple)، وتی: لەبەرئەوەی زۆر حەزم لە میوەی سێوە!

# کۆڕەوی مەزن

زاهیر زانا



کۆڕەو بڕیاری گەلێك بوو لە پێناوی ئازادی، بێ دادیەتی لە زوڵمو ستەمو بێ دادی، لە کۆڕەودا زمانی حاڵی گەلێك هاتە گۆو هاواریکرد: ئەگەر زوڵمو چەوساندنەوەو داپڵۆسین نەڕوات، ئەوا ئێمە دەڕۆینو ئامادەنین جارێکی تر سەری بەرزمان، بخەینە ژێر چەپۆکی بەعسییە فاشیستەکان، کۆڕەو خستنەگەڕی تەواوی توانای گەلێکی چەوساوەبوو، بۆ گەیشتن بە سەربەستیو بەردەوامی بوو لە خەبات دژی داگیرکاریو کاولکاری، کۆڕەو گەورەترینو درێژترین ڕێپێوانە لە مێژوودا، دژی تاریکیو چەوسانەوەو ستەمو داپڵۆسینو سەرکوتکردن، کۆڕەو خۆ بەدەستەوە نەدانو بەرخودانی گەلێکە، پاش بەهاری ئازادیو ڕاپەڕینو ڕێگری گەڕانەوەی زستانە لە دڵی بەهاردا.

کۆڕەو پێمان دەڵێت: کاتێك تواناو وزەکان کۆ دەبنەوەو ئامانجێك دیاری دەکەن، ئیتر شتێك ناتوانێت بیان وەستێنێو پێمان دەڵێت: ئەوەی تامی سەربەستی بچێژێت، ناتوانێت بەدیلی بژی، ئەگەرچی لەو پێناوەشدا ڕەنجو ماندوبوونو نەهامەتی زۆر بچێژێت، لە کۆڕەودا گەلێك گیانی کردە سەردەستی بۆ بەدەستهێنانی سەربەستی، لە کۆڕەودا گەلی کورد نرخی ئازادی داو بە هەوڵو تێکۆشانو خەباتی خۆی، ڕۆژێکی نوێی هێنایە ئاراوەو پەڕەیەکی نوێی هەڵدایەوە.

ئێمە ئێستا کە هەموو ساڵێك یادی ئەو ڕووداوە مەزنەی ساڵی ١٩٩١/٤/٢ دەکەینەوە، دەبێت ئەوە فێربین، ئێمە هەمووان بە یەکەوە جوانینو بە یەکەوە دەتوانین فێربین، دەبێت بزانین کە هەموو شتێك نرخی خۆی هەیە، گەر بەهاکەی نەدەین بەدەستی ناهێنین، دەبێت وەکو گەلێك بە خۆماندا بچینەوەو بزانین تا چەند ئامانجەکانی ڕاپەڕینو کۆڕەوە مەزنەکە هاتونەتە دیو چیمان ماوەو ئامانجو بڕیاری نەتەوەکەمان لە قۆناغی داهاتودا چییە، دەبێت چ هەنگاوێك هەڵبگرین، دەبێت بەهاکانی دادپەروەریو ئازادیو یەکسانی باشتر بچەسپێنینو هەلو دەرفەتەکان، بۆ هەموو تاکەکانی ئەم کۆمەڵگایە بسازێنین، دەبێت بڕیاربدەین گەلێکی خۆژیەنو پشت بەخۆ بەستوبینو تەممەڵیو بێکاری لەناوبەرینو لە گەلێکی بەکاربەرەوە ببینە میللەتێکی بەرهەمهێن، ئەمەش کارێکە ئەستەم نییە، بەڵکو پێویستی بەپلانو نەخشەو بەدواداچون هەیە، تا ئەوەی لە هەموو بوارەکاندا بەرەو پێش بچین، با چاو لەو وڵاتانە بکەین، کە ئامانجێکیان بۆ خۆیان دیاریکردووەو بڕیاریانداوەو سەرکەوتووبون، بۆ نموونە سریلانکا کاتێك لە هیندستان جیابووەوە، خەریکبوو لە برسا هەموو میللەتەکەی دەمردن، دوای ئەوەی سەرۆکەکەیان چوو بۆ هیندو داوایکرد یەکبگرنەوە، بەڵام هیند داواکەیانی ڕەتکردەوە، گەڕایەوە وڵاتەکەیو داوای لە میللەتەکەی کرد، شۆڕشێکی کارکردنی لەگەڵدا بەرپا بکەن، سەرەنجاە گەیشتە ئەوەی کە ئێستا نرخی دراوی سریلانکی، چەند بەرابەری هیندستانەو بگرە لە پێشکەوتنو ئاستی گوزەرانیشدا بەراورد ناکرێن، با ئێمەش دەست پێ بکەینو ئامانجو بڕیارێك بۆ نەتەوەکەمان دیاری بکەینو نەوەی نوێ پەروەردە بکەین، لەسەر ڕەوشتی بەرزو خۆشەویستی نیشتیمانو کارکردن، با یادکرنەوەمان تەنها ڕۆتینێك نەبێتو بەڵکو فیلمی دیکۆمێنتاریو ئەرشیفی دروست بکەینو ئەو مێژووە بپارێزین، چونکە ئەو میللەتەی ڕابردوی خۆی نەزانێت، داهاتووشی ڕۆشنو پرشنگدار نابێت، با لەو یادەدا، کۆنگرەی نەتەوەیی ببەستینو بڕیاری کارکردنو پشت بەخۆ بەستن بدەینو بەپێی پلانو بەرنامەیەك کاربکەین، کە ئەو هەموو وزە مرۆییەی هەمانە، بیخەینە گەڕو بیانکەینە هێزێکی بەرهەمهێن، نەك لە نیشتیمانی خۆیاندا بێکارو چاوەڕوانو دەستەپاچەو خەفەتباربنو هەست بە غەریبی بکەن.

و. زانا قەرەداغی

# پێوەرەکانی هاوسەری سەرکەوتوو

گەیشتن بە پەیوەندییەکی سەرکەوتووی نێوان هاوسەران، کارێکی ئاسان نییەو لە خۆڕایش درووست نابێت.

بەڵکو بە ئاکام گەیشتنی ئەو پەیوەندییە سەرکەوتووە، دەکەوێتە سەرشانی هەردوولایان کە لە چرکەساتی یەکەمی پرۆسەی هاوسەرگیرییەکەیانەوە بڕیار بدەن، ئەمان وەك تیمێك کار بکەن کە لە دوو کەس پێکهاتبێت، ئەو تیمە هەر یەکێکیان کەموکورتی ئەوی دیکەیان تەواو بکات، هەردوولاش هەوڵ بدەن، کە کەشتی پەیوەندی هاوسەرگیرییان، بگەیننە کەناری ئارامی.

**پەیوەستبوون:-**

گرنگترین پێوانە بۆ ڕاگرتنی پەیوەندی هاوسەرگیریي، هەستکردنی هەردوولایە بە پەیوەستبوونیان، بەو پەیوەندییەی کە هەیانە. چونکە پەیوەندی نێوان هاوسەران، وەکو پەیوەندی نێوان دوو هاوڕێ نییە کە لەسەر شتێکی ئاسایی، یاخود مشت ومڕێك لە یەکتری جیاببنەوە، یاخود وەك پەیوەندی نێوان دوو دراوسێ نییە، کە بە دوورکەوتنەوە لە یەکتر پەیوەندییەکەیان کۆتایی پێ بێت، ئەمەش بە مانای ئەوە دێت، کە هەریەك لە ژنو پیاو هەستی پەیوەستبوون، یان هەبێت بەرامبەر ئەو لانەیەی کە درووستیان کردووە، تا بتوانن وەك دوو هاوسەر درێژە بە کاروانی ژیانیان بدەن، ئەگەر لایەکیان بیری جیابوونەوە لە خەیاڵیدا بێت، ئەوە بێگومان بە هۆکارێکی سادە هۆگرییان بۆ یەکتری نامێنێت.

**ڕێزگرتن لە یەکتری**

ئەگەر ئەتەوێت پەیوەندی هاوسەرگییرییەکەت سەرکەوتو بەردەوام بێت، ئەوا دەبێت هەردوولا ڕێزی یەکتری بگرنو نابێت ئەو ڕێزە نێوانیان بە بوونی ڕووداو، یان درووستبوونی کێشەی نێوانیان نەمێنێ، ڕێزگرتنی ئافرەت لە هاوسەرەکەی زیاتر لە هەموو مامەڵەو هەڵسوکەوت کردنێك دەکرێت لە هاوسەرەکەیەوە سەرچاوە بگرێو ڕێزگرتنی پیاویش لە پێگەی هاوسەرەکەی، زیاترە لە هەرشتێکی کتوپڕو دەچێتەوە سەر ئەو مرۆڤەی کە هاوسەرگیری لەگەڵ کردووە، بۆیە دەبێت هەر یەکێکیان پەیوەندی نێوانیان لەناو دەروونی خۆیان بەرزو پیرۆز سەیر بکەنو ڕێز بگرن لەو پەیوەندییەی کە لە نێوانیاندا هەیە.

**خۆشەویستی بە کردار**

پێوستە هەردولایان واز لە خەیاڵی ئاڵو واڵاو ڕەنگاو ڕەنگ بهێنن، چونکە هاوسەری ژیانت لە هەموو هەڵسوکەتی ژیانت هاوبەشتەو ئەوەش بزانە کە خەیاڵکردن لەگەڵ هەڵسوکەوتکردن زۆر جیاوازە، بۆیە دەبێت هەردوولا بزانن کە ژیان بەو جۆرە نییە کە لە خەونو خەیاڵ وێنا دەکرێتو ئەوە قبوڵ بکەن، کە واقیعو ژیانی هاوبەشیان ئەوەیە کە دەیبینن دوور لە هەر جوانکارییەکی فێڵاویو خۆیان ئامادە بکەن، کە ساتێك لە ساتەکانی ژیانی هاوبەشیان ڕەنگە تووشی ناڕەحەتی کێشە ببنەوە لە نێوانیاندا.

**پەیوەندی ڕاستگۆیانەو بەردەوام**

ناکرێت پەیوەندییەکی هاوسەرگیری دابنرێت، بەسەرکەوتوو لە سەربنەماگەلێکی هەڵسوڕاو پتەو نەبێت، ئەگەر بێتوو پەیوەندییەکان بوونی نەبێت، یاخود هیچیان بەرانبەر دڵو ویژدان خراپەی نەبێ. زۆربەی هاوسەران بڕیاریان داوە لە تەك یەکتردا مامەڵە نەکەن، تەنیا لە چوارچێوەی عەقڵو مەنتیقدا نەبێو بەس، ئەوە لە بیر دەکەن کە دڵ پێویستی بە دڵی تر هەیە، بۆ هاوڕێی ژیانیو هاوبەشی ژیانی، پەیوەندییەکی گەرمو گوڕو ڕاستگۆیانە، تاوەکو ژیان بەسەرکەوتوویی بەردەوام بێ.

**لەبیری منداڵەکاندا بن**

دەبێت هاوسەران ئەوە بزانن، کە سۆزی پەروەردگارە بەرامبەر بە مرۆڤەکان، کاتێك ئەرکی بەرپرسیارێتی منداڵ دەخاتە سەرشانیان، ئەم بەپرسیارێتییە وای لێ دەکات کە بە چاوێکی دیکە سەیری پەیوەندی نێوانیان بکات، نەك بە شێوەی ترسو دوژمنایەتی، بەڵکو بەچاوی هاوبەش سەیری دەکات، لەو پرۆژەیەدا هیچ شتێك گرنگتر نییە لە ژیاندا، ئەندازەی ئەوەی کە پەروەردەی منداڵ بکەیت، بە شێوازێکی درووستو لەسەر بنەمای ئاینو ئاکاری جوانو ڕەوشتی بەرز.

بێگەرد فارس



# منداڵ، کام ڕەوشتەی تۆ وەردەگرێت؟

**یەکەم:** منداڵ لە دوو ساڵییەوە، دەتوانێت وشەکان بڵێتەوەو دووبارەیان بکاتەوە، هەروەها لەو قۆناغەدا، ئامادەیە ئەو ئاراستە پەروەردەییانەی گەشە بە ڕەفتاری دەدەن، وەربگرێت.. هەر لەو تەمەنەدا، پێویستە دایك، منداڵەکەی فێری چۆنێتیی هاوکاریکردن بکات، لەگەڵ دەوروبەریداو بەتەنها شتەکان بەکار نەهێنێت، بەڵکو لەگەڵ منداڵانی تردا بەشی بکات؛ بۆئەوەی نەبێت بە کەسێکی خۆپەرستو بەتەماع.

**دووەم:** دەبێت دایك، بەتەواوی ئەوە بزانێت، ئەو پێشەنگو نموونەیە بۆ منداڵەکانی، لەبەرئەوە نابێت وشەی نەشیاوو جنێودان بەکار بهێنێت، لە دوایشدا ئەگەر ئەوان بەکاریان هێنا، سەرزەنشت بکرێنو سزابدرێن.

**سێیەم:** خاوێنیو ڕێکخستن، دوو شتی زۆر گرنگن، پێویستە دایکی هۆشیار، منداڵەکانی فێربکات، ئەوەش پێویست بە وتن ناکات، تەنها بە بینینی دایکیان بە ڕێکخستنو پاكو خاوێنی؛ چ لە ناوماڵ، یان دەرەوەی ماڵ بۆ ئەوان نموونەیەکەو بێگومان لاسایی دەکەنەوە، تەنانەت ئەگەر پێشیان نەڵێت.

**چوارەم:** بۆئەوەی منداڵەکانت فێری درۆکردن نەبن، تۆ بەهیچ شێوەیەك درۆیان لەگەڵ مەکە، هەمیشە ڕاستگۆبە لەگەڵیاندا، کاتێك گفتووگۆیان لەگەڵدا دەکەیت، وایان لێبکە لەسەر ڕاستگۆیی ڕایان بهێنیت، تەنانەت بۆ شتی زۆر بچووکیش، لەگەڵیاندا ڕاستگۆبە، چونکە ئەگەر بتبینن، ڕاستی ناڵێیت.. ئیتر متمانەت پێ ناکەن؛ چ بە وتەکانت، یان بەڵێنەکانت.

**پێنجەم:** وا خۆت ڕابهێنە؛ ڕێگە بە منداڵەکەت نەدەیت، ئەو وتانەی لە کەسێکی ترەوە بیستوویەتی، بۆت بگێڕێتەوە، ئەوە هانی دەدات فێری سیخوڕیو نەپاراستنی نهێنی و ئەمانەت زایەکردن ببێت.. تەنانەت ناتوانێت، بەڵێنەکانی بەرێتە سەر.

**شەشەم:** منداڵەکانت ڕابهێنە، هەر لە بچووکییەوە بە ئەدەبەوە بدوێنو گوێ بۆ قسە بگرن، ئەوەش پێویستی بە بەهێمنیو لەسەرخۆییو ڕاستگۆییە لەگەڵیاندا، هەروەها ڕایان بهێنە؛ زۆر ببیستنو کەم بڵێن، کەسی تێگەشتوو، زیاتر گوێ دەگرێت، بەتایبەتی بەرامبەر کەسانی لە خۆیان گەورەترو زاناتر، ئەوەش لە ڕێی تۆوە دەبێت؛ بەگوێگرتن لێیانو قسەیان پێنەبڕیتو خۆت بە شتی ترەوە سەرقاڵ نەکەیت.

**حەوتەم:** بە دەنگی بەرزو زبر، لەگەڵ منداڵەکانتدا گفتوگۆ مەکە، لێیان تووڕە مەبەو لەگەڵیاندا بەشەڕمەیە، ئەوە وایان لێدەکات گێرەشێوێنو ئاژاوەچیو ناجێگیر بن، بەڵام فێریان بکە گفتوگۆیەکی هێمنو ئامانجدارانە بکەن؛ بۆئەوەی بگەنە ئەوەی مەبەستیانە.

**هەشتەم:** هەوڵ بدە ئارامیو ئاسایش لە ناخیاندا بچێنیت، لە مامەڵکردنت لەگەڵیاندا، هاوسەنگو جێگیربە؛ بۆئەوەی لە کەشێکی ڕاڕادا پێنەگات، چونکە لە دواییدا، کەسێتییەکی لەرزۆکی دەبێت، ناتوانێت بەها تایبەتییەکانی خۆی پێك بهێنێت، بۆیە پێویستە لە سەرەتای سێ ساڵی یەکەمیدا، ڕێ بۆ ئەوە خۆش بکەیت.



گوڵان حەمەئەمین



# ئادابە کۆمەڵایەتییەکان

## بەشی سێیەم

ئەتەکێتی گاڵتەوگەپکردن: مـــرۆڤ لە هەر تەمەنێکدا بێت، پێویســـتی بە چەند کاتێکی پێکەنینو تەرفیهی هەیە بە تایبەت منـــداڵ، بەڵام دەبێـــت منداڵەکانمـــان فێربکەین بـــە ئەدەبێکی جوانەوە گاڵتەو شـــۆخی لەگەڵ کەســـانی دی بکـــەن، جا لەگەڵ هاوڕێیانی خۆیان بێت، یاخود لەگەڵ گەورەکان، پێویســـتە ئەوە بزانن کە نابێت سنور بشکێنن، بەوەی هەندێ قسەو هەندێ یاری بکەن، لەگەڵ گەورەکاندا، نابێت لەنێو شـــۆخیو گەمەدا ئازاردان، یاخود شـــکاندنی هەســـتی کەســـانی دی هەبێت، ڕێگەش نەدەین منداڵ هەموو شـــتێك بکاتە گاڵتە، یاخود بەکارهێنانی ناڕاســـتی، پاشـــان بڵێت بە گاڵتەم بوو! هەموو ئەمانەش بە چاودێریکردنی منداڵ، ئاگادارکردنەوەیو پێ وتنو فێرکردنی دەبێت، ئەتەکێتی پیرۆزباییکردن، دیارە منداڵ لە تەمەنی ســـەرو هەشت ساڵییەوە هەست بە بوونی خۆی دەکات، لە نێو هاوڕێو خزمانو خانەوادەدا؛ بۆئەوەی ئەم خواســـتە لە ناخیدا بێتە جێو هەروەها بێتە جێی ڕێزو خۆشەویســـتی دەوروبەر زۆر جوانە فێـــر بکرێت، لە کاتی بۆنەو کاتە پێویســـتەکاندا پیرۆزبایی بکات، ئەگەر پێویستی کرد دیاریشـــی بۆ ئامادە بکرێت، باشـــتر وایە ســـەرەتا لەگەڵ خۆیدا کاتێـــك لە قوتابخانە ســـەرکەوتوو ئەبێت، یاخود لە جەژنەکاندا بە جوانترین شـــێوە لە ئامێز بگیرێتو پیرۆزبایی لێ بکەیت، تا ئەویش بتوانێت بەو جۆرە بێت بۆ دەورو بەر.

**ئەتەکێتـــی ســـەردانی نەخۆش:** کاتێـــك منداڵێکی هاوڕێی منداڵەکەت نەخۆشە، یاخود لە نێو خانەوادەدا منداڵێك نەخۆشە منداڵەکەت هان بدە، لەسەر هەواڵپرسینو سەردانکردنو دوعای خێـــر بۆ کردنـــی، بـــەڵام بەرەچاوکردنی ئەم خاڵانە ســـەردان لە کاتـــی خۆیدا بێتو کـــەم بخایەنێت، هیـــوای چاکبوونەوەی بـــۆ بخوازێت، لاتان ســـەیر نەبێت ئازیزان کـــە دەکرێت چەند وشـــەیەکی جوانـــی فێر بکەیـــت کاتێك چـــووە لای هاوڕێکەی (نەخۆشـــەکە)، بیڵێت تا لە گەورەیشدا کەسێکی شەرمن نەبێت وەك ئەوتـــرێ، بێ دەمو زمان نەبێـــت بەدەمو لەفز بێتو وردە وردە هەست بە گەورەبونی خۆی بکات، ئەتەکێتی پژمەو کۆکەو باوێشـــك، منداڵ نازانێت کامە کار ناشـــیرینە تەواوی شـــتەکان پێویســـتی بـــە فێرکردنە، فێـــری بکە، لە کاتی پژمین دەســـت بەدەمییەوە بگرێـــت، ڕوو وەرگێڕێتو بڵێ (الحمدلله)، لە کاتی کۆکـــەدا دەستەســـڕ بەکاربهێنێتو دەســـت بەدەمییەوە بگرێت، ئەگـــەر لە کاتی نانخـــواردن بوو لە ســـفرەکە دوور بکەوێتەوە، لە کاتی باوێشـــکدا بە هەمان شێوە دەست بە دەمییەوە بگرێت، کۆمەڵێـــك ئەتەکێتی گشـــتی لە نێو خێزانـــدا بەرامبەر منداڵ پێویستە ڕەچاو بکرێت:

*کاتێك کارێکت بۆ دەکات سوپاسی بکە.

*کاتێك داوای کارێکی لێ ئەکەیت، بڵێ بێزەحمەت، یان بە یارمەتی خۆت.

* هیـــچ کات بۆچوونـــی تـــەواو ڕەفـــز مەکـــەرەوە، مەڵێ تـــۆ نازانیـــت، یاخـــود تۆتێ ناگەیـــت، یاخود بەڵکـــو بڵێ تۆش بۆچوونەکەت باشـــە بەڵام من ئەمەم پێباشـــە، یاخود پێم وایە ئاوەها سەرکەوتوو دەبێت.

* هیچ کەس بە ناوی نەشیاو ناومەهێنە لەپێش چاوی.

* بەردەوام بەجوانترین ناو ناوی بهێنە.

* لەگەڵ هاوسەرەکەتدا بەردەوام ڕوخۆشو ڕێزداربە، هیچ کات خۆتان بە زویر پیشان مەدەن لای منداڵ.

* بەیانیان بەڕووی خۆشـــەوە بانگـــی بکە، کاتێك لەخەو هەڵدەســـتێت خەندەیـــەك، وشـــەیەکی شـــیرین بەرامبـــەری بەکاربهێنە، تا خێرا بیروبۆچونی خۆشی بۆ درووست ببێت.

# گرنگی چیرۆك بۆ منداڵ لە قۆناغی بنەڕەتیدا

موحسین ئیسماعیل

خوێندنەوەی چیرۆك بۆ منداڵان تەنها بۆ كات بەسەربردن نییە، بەڵكو خوێندنەوەی چیرۆك دەبێتە هۆی بەهێزبوونی بیرتیژیو خەیاڵی منداڵان، لە هەمووی گرنگتر بە هۆی چیرۆكەوە بە وشەگەلێكی زۆر ئاشنا دەبێتو یارمەتیدەر دەبێت بۆ فێربوونو دەربڕینی دەنگە جیاوازەكانی زمان لە قۆناغەكانی سەرەتاییدا، لەو حاڵەتەدا نرخی ڕاستەقینەی خۆی تێدەگات، كە ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی لە تەمەنێكی بچووكەوە حەزو خولیای بۆ خوێندن زیاتر بێتو خەونو خەیاڵو پرسیاری لا درووست دەبێت، ئەمەش وا دەكات هەستی بەدواداچون بۆ شتەكان لای پەیدا ببێتو هانی دەدات بۆ لێكۆڵینەوەی زیاتر لە شتەكانی دەوروبەری...

جیاوازی لە نێوان چیرۆك خوێندنو تەماشاكردنی تەلەفزیۆندا، ئەوەیە كە چیرۆك وا لە منداڵان دەكات، كە زانیاریو وێنە خەیاڵییەكانی خۆی بەكاربهێنێتو بەشێوەیەكی جوان كە خۆی حەز دەكات، بەڵام تەلەفزیۆن مێشكیان خاوو تەمەڵ دەكاتو هەستو خەیاڵیان دەكوژێت، بیركردنەوەی كاریگەریان لێدەستێنێت...

بە خوێندنی چیرۆك منداڵ بە كلتورو فەرهەنگو دابو نەریتی نەتەوەكەی خۆی ئاشنا دەبێت، هەر بە خوێندنی چیرۆك، منداڵ فێری ڕاستگۆییو فیداكاریو ئازایەتی دەبێت، بەڵام زۆرجار منداڵ بە هۆی تیڤییەوە فێری درۆو ڕەوشتی خراپو لادان لە دابو نەریتە كۆمەڵایەتییەكان دەبێت، ئەگەر بكرێت چیرۆك تەنیا بە زمانی دایك نەبێتو بە زمانەكانی تریش بخوێنرێتو منداڵ گوێبیستی چیرۆك بێت؛ بۆئەوەی بناغەو سەرەتاكانی فێربوونی زمانی بیانی لا بە هێز بێت...

كاتێك وشەكان بە گوێی منداڵ دەگات لە خەیاڵیدا دەبێتە وێنەیەك، كە منداڵ خۆی تێدا دەبینێتەوە، وەك پاڵەوانی چیرۆكەكە ئەو كاتە هەستی درووستكردنی داهێنانو هێزی وتنو دەربڕینی هەستەكانیو بڕوابەخۆبوونو وشەش، لای زیاد دەبێتو یارمەتی دەدات، هێواش هێواش توانای خۆی پەرە پێبدات...

چیرۆكو داستان، كاریگەرییەكی زۆری هەیە لەسەر تێگەیشتنو پێگەیشتنی منداڵ، زۆر لە بنەما ئەخلاقییەكان شارەزا دەبێت، وەك ئازادیو هەستی نەتەوایەتی چاكخوازیو بەرپرسیاربوون لە حەقو مافی خۆیو بەرهەڵستی زۆرداران فێر ببێت، هەموو ئەم خاڵانە بنەمای سەرەكی چیرۆكی منداڵانن.





# نیگایەکی میهرەبان!

ئەسکەندەر ڕەحیم

دۆستێکم بۆی گێڕامەوە: لەم ماوەیەدا، لە چوارڕیانێکداو لە پاش گڵۆپی سووری ترافیکەکە، خەریکی تەلەفۆن کردن بووم، بەگوێی کەسی بەرامبەردا، هاتوهاوارم دەکردو پێم دەگوت: کارێکت پێ دەکەم، با بە دەواری شڕی نەکردبێت، دەبێت بزانیت لەگەڵ کێدا تێکەوتوویتو لەگەڵ چ کەسێکدا، شانەخڕێ دەکەیتو مۆبایلەکەم بەسەریدا داخستەوە.

کیژۆڵەیەکیش، کە چەپکە نێرگزێکی بەدەستەوە بوو، لەبەرئەوەی بەژنو باڵای بە جامی ئۆتۆمبێلەکە نەدەگەیشت، خۆی بەرز کردەوەو گوتی: کاکە، گوڵە نێرگز! کاکە، ئەم چەپکە نێرگزە بگرە.. منیش کە لەوپەڕی پەستیو بێزاریدا بووم، خەریك بوو، هاوار بەسەر ئەو کیژۆڵە بێزارکەرەدا بکەم.. بەڵام ئەو هەر دەستی هەڵنەگرتو هەر خۆی بەرز دەکردەوە، منیش جامی سەبرم سەرڕێژی کردو جامی ئۆتۆمبێلەکەم دادایەوە، بەتووڕەییەوە گوتم: بڕۆ بەدوای کاری خۆتدا؛ من گوڵو نێرگز ناکڕمو نامەوێت.. بۆچی هێندە بێچاووڕوویت، شەرم ناکەیت، دەبێت منداڵانی وەکو تۆ، فێری ئەوە بکرێت، کە نەچێتە سەروەختی خەڵکیو بێزاریان نەکات...

کیژۆڵەکە ترساو کەمێك کشایەوە، بەتووڕەبوونەکەی من، ڕەنگی شێوا.. کە چاوم بە چاوەکانی کەوت، یەکسەر دایگرتم! نەمزانی بۆچی یەکسەر زمانی بەسترا؟! هەڵبەت وەڵامی ئەم پرسیارەم، پاش چەند چرکەیەك دەست کەوت.

کاتێك بێدەنگ بووم، دەستم لە پیشاندانی زەبری تووڕەیی خۆم هەڵگرت، کیژۆڵەکە بەترسەوە هاتە پێشو گوتی:

کاکەگیان، من نێرگز نافرۆشم! من بنێشت دەفرۆشم! ئەو هاوڕێیەم دەبینی، کە لە شەقامەکەی بەرامبەر، گوڵ دەفرۆشێت، ئەم چەپکە نێرگزەم وەرگرتووە بۆ تۆ، تا هێندە دڵتەنگو بێتاقەت نەبیت! چونکە هەر لە دوورەوە، دیار بوو، تووڕەو نارەحەتیت، ئەگەر توندو تووڕەبیت، دڵت نەخۆش دەکەوێتو وەکو باوکم، دەبێت بڕۆیت بۆ نەخۆشخانە.. منداڵەکانیشت وەکو من، داماوو هەڵوەدای شەقامەکان دەبن، خەریکە ..........

ئیدی نەمزانی، ئەو فریشتەئاسایە چی گوت؟!

ئێستە لە هۆکاری بێدەنگبوونی لەپڕم گەیشتم!

زللەیەك، کە ئەو کیژۆڵەیە، بە نیگا میهرەبانەکەی لە منی دا، هێزی قسەی لەبەر بڕیم! ئەو بە گوتەکانی خەریکی پلیشانەوەی وردە فیزی بێنرخم بوو!

دەنگێکی پرسکاڵاش، لە ناخمەوە گوتی: هەی بچکۆلە بەزەییت بێت؛ چونکە مرۆڤ، بۆ لێدانی یەك کەس، هەرچیی هێزی خۆی هەیە، بەگەڕ ناخات، بەڵام درێغی لە هێزو نەوای نەی قسەکردن ناکات! تا خۆم ئامادە کرد، شتێك بڵێم، کیژۆڵە فریشتەئاساو بێفیزو گورجوگۆڵەکە، دوور کەوتەوە، تەنانەت بنێشتیشی پێ نەفرۆشتم!



# مەدرەسەکەی تۆ

گەرمیانی

هیچم نەدەزانی، تا نەبوومە شاگردی تۆ! هیچم نەدیبوو، تا نوری ڕوخساری تۆم نەبینی!

ڕێگایەکم نەدەناسی بۆ دڵم، تا نەهاتمە دیوەخانی ئەوینی تۆ!

ئەرێ دڵ بێ شەرابی لەعلی گوڵ ڕەنگت لە گوڵ چ بکا!!
کە جیلوەی گوڵ لە گوڵشەندا نەبێ، بولبول لە چڵ چ بکا؟!

-مەحوی-

لە قوتابخانەکەی تۆدا پێش ئەوەی قەڵەمێکم بدەیتێ، گوڵێکت پێشکەش کردم!

ناخی منت بە گوڵاو بسمیل کردو بە زمانی چرپە، یەکەم وانەی ئەوینت پێ خوێندم!

پێش ئەوەی تۆ بناسم، من ئاوارە بووم، جێگایەك نەبوو ئۆقرەی تێدا بگرم! سێبەرێك نەبوو پشووی لە سایەدا بدەم.....

چ فەزڵێکی گەورە بوو، دڵت بۆ کردم بە نیشتمانو چاوانت

بۆ کردم بە ئامێز!

لە وەیشومەی پاییزی بێ سەمەری عومرم ڕزگارت کردم، منت بە ڕێگایەك ئاشنا کرد، ئیدی نەمتوانی ئەو تەریقەتە فەرامۆشکەم!

کە هەڵگیرسا لە نووری بادە، شەمعی حوسنی جانانە
نەچێتە سەر تەریقەی حەزرەتی پەروانە، دڵ، چی بکا؟! -مەحوی-

هەرگیز ئەو ڕۆژەم لە یاد ناچێ، کە گەیشتم بە ئوستادی دڵم، میری ڕۆحم!!

سەرەتا لە هەیبەتی تۆدا نەمتوانی بکەومە سەر ئەژنۆ، وەکو شاگردێك بە چۆکدا دەستەونەزەر لە خزمەتتدا پەڕاوی دڵم بکەمەوە، بە پێوە لە خزمەتتدا وەستام! ڕووی دڵم کردە نیگای چاوەکانت!

ئەو ڕۆژە من دەرمانی دەردی خۆم دۆزییەوە، گەیشتم بە حەکیمی ڕۆحم، بە شازادەی مەملەکەتێك ئاشنابووم، ئیدی بە هیچ لایەکا ئیلتیفاتێکم نەما!

وا سەرم دانا بە عەزمی بەردە بازی ڕێگەکەت
مەرهەمی دەردی سەری من، وا بە گەردی پاتەوە -ناری-

هێدی هێدی دەستتگرتم بۆ دەریای زیوو، دەڤەری بەفرو، گوڵزاری ژێر پروشەی شەونم.

بە خەندەکانت، وانەکانت بۆ ئەدا دەکردم، بە نیگاکانت، پەروەردەت دەکردم!

منی سەرسام، چیم دەزانی مامۆستاکەم؟!

بە هەڵمی هەناسەت، بەستەڵەکی بێ هیواییو شەختەو زوقمی غوربەتو تەنیایت تواندمەوە!

وای لە فەیزی ڕەحمەتت نازدارەکەم!!

لێوی تۆ، ئاوی بەقا من خزرم
فەیزی تۆ ڕەحمەتو من سەوزە گیا -نالی-

ئەو کاتەی کەشکۆڵی دڵم بۆ مرواری لێوەکانت والآ کرد، وشەکانت وەکو شەهدی هەنگوین دەڕژانە نێو ڕۆحم، لە لێوەکانی تۆوە ئەلفو بێی ژیان فێربووم!

لە ئامێزی تۆدا سۆزێکی دایکانە، ئارامی بەخشی بە ڕۆحم!

لە نێو پەنجەکانی تۆوە، میهرەبانی ڕژایە نێو سینگم!

شەپۆلی عیشقی تۆ بوو، غەرقی ئەوینی ئەبەدیی کردم!

هۆ وڵاتی عاشقانو ماشقانو دڵتەڕان
ئەم هەموو عیشقە چییە دەڕژێ لە شارو دێتەوە؟! -کوردۆ-

ئەو کاتەی لە ئاوریشم نەرمتربووی لەگەڵم، لە سروە فێنکتر بووی بۆ ناخم، ئەو کاتەی کەمەندکێشی ڕۆحت کردم، ئیدی نەمتوانی ئەو هەوارە جێبێڵم!

ئەو کاتەی بە خەیاڵ دەمویست لە گڕی ئەو ئەوینە هەڵێم، دڵم خەریکبوو دەبو بە قەقنەس، نەیدەتوانی بە خەیاڵیش وێنای ئەو عەزابە بکات.

خەیاڵم بوو لە خەیاڵم دەرتکەم
ئیتر ناوت لەسەر زارم تەرکەکەم
بەڵام نەمتوانی جوانێ یەك سات
لە هێلانەی دڵم تۆزێ دەرتکەم

لە مەدرەسەکەی تۆدا فێربووم، من چیمو کێم؟!

لە خزمەتی تۆدا بەهای خۆم زانی! تۆ فێرت کردم کە خۆم خۆشبوێ! تۆ بوویت بۆ یەکەمجار خۆمت نیشاندام!

پێت گوتم: تۆ جوانی!

ئای مرۆڤ بێ ئەوین، لە چی تاریکستانێکا دەژی!

ئێستا دەزانم، تا تۆ کاڵای عیشقت نەکردە بەرم، من ڕوتو قوت بووم!

تا تۆ لە کانیاوی ئەوین پیاڵەی ئاوی حەیاتت پێ نەبەخشیم، من تەنها بە لاشە زیندووبووم!

تا نەهاتمە دیوانی تۆ، بۆنی بەهەشتم نەکرد!

تا نەبوومە شاگردی تۆ، لە زانستی ئەوەلینو ئاخرین مەحروم بووم.

من بێ تۆ جگە لە هیچ، ناسنامەیەکی دیم نەبوو!

ئێستا دەزانم مەحوی بۆچی دەیگوت:

دەرسی عیشقم هەر لە کن پەروانە، یا بولبول بووە
بیگەمێ، یا نەیگەمێ، هەر مەشقی ئوستادێ دەکەم

خۆ ئەگەر ئەو ئوستادە، زێدو ئاوو کەسو کارو هاودەمو هاوژوانی شەوو ڕۆژت بێ!

سۆمای چاوو تیشکی خۆرو هەناسەی ڕۆحو خەونو خۆزگەو خەیاڵت بێ!

دەبێت ئیدی چۆن بتوانی، چرکەیەك بێ ئەو ئوستادە بژی!

بمبورە مامۆستاکەم، لەم شاگردە سرکو نەزانەی خۆت ببورە.....

ئاخر من جاران کەسێك نەبوو لە عالەمی شەهادەدا هاودەمم بێ، تۆ ئێستا لە عالەمی غەیبیشدا لەگەڵمی!

جاران کەس گوێی بۆ حەقیقەتیشم نەدەگرت، ئێستا تۆ گوێ بۆ خەونەکانیشم دەگری!

بمبورە کە جێمدێڵی، ئیدی من هیچم بیرنامێنێ، خۆشم ناناسمەوە، وا دەزانم تۆ هەموو شتێکت لێ سەندووم، لە کاتێکدا تۆ سەرچاوەی هەموو شتێکی منی!

من ئەو کاتە عەقڵو ئاوەزم نامێنێ.. نازانم چی دەڵێم، ئادابی ئەوینو مەقامی ئوستادی تۆ لەبیر دەکەم!!

بمبورە ئەی خاوەنی گەورەترین مەدرەسە!!

من پەروەردەی مەدرەسەکەی تۆم... من شاگردی تۆم... بۆ هەمیشەی هەمیشە!

ع. ش. شێرکۆ

# نامە نوورینەکان

نامـــەی ڕابـــوردوو، حـــەزم نەدەکرد ماڵاوایيـــت لێ بکەمو خامەکەم دابنێم!

چون لەوە ناخۆشتر نییە، لە گەرمەی زیکری مەحبووبی خۆتدا، لە قسان بوەستیو دەست هەڵگری!

ئازیزم لەوێ ڕا، حەڤدە پێناسەمان، بۆ خۆشەویستیی خودا باس کرد.

هەژدەهەم: یەکتاپەرســتیی مەحبووب، بە ویستو ئیرادەو ئیخلاصو ڕووکردنی هەموو ویســتو داوایــەك بۆ ئەو! هەرچی دەیکەی، بۆ وییەو هەرچیت دەوێ، تەنها لەوی داوا دەکەی!

نەك لە کەسی دی!

نابێ ئیددیعای خۆشەویستیی ئەو بکەیتو بەڵام دەست لە غەیری ئەو پان بکەیتەوە، لە کەســێکی دی بترســیو ڕووی ڕازو نیازت لەو بێ!

نۆزدەهــەم: یەکتاپەرســتیی مەحبــووب کــە خودایە لە "خۆشەویســتیدا"، بەشێوەیەك، کە جگە لە ئەو، کەسی دی، دڵی داگیر نەکردبی! چون هەر کات لە دڵدا، بەشێك درابوو بە غەیری خودا، مەســکەنێك هەبوو، بۆ خۆشەویســتیی کەسێکی دی، ئەوا ئەو خۆشەویستییە، تەواو نییە!

بیســتەم: چاوپۆشینی دڵ، لە ماسیوای مەحبووب ئێرەییو غەیرەیە، بەڵام بەرامبەر بە مەحبووب هەیبەتو شەرمو شکۆیە، دەبــێ چەندەت خــۆش دەوێ، ئاواش تەعزیــمو هەیبەتو ڕێزی بپارێزیو بەرامبەری چاوانت دابخەیت!

بیســتو یەکەم: خۆشەویستیی ڕاســتەقینە ئەوەیە، کە بە تەواوی مەیل، مەیلت تەنها لەو بێ!

ئەوت لە سەرو ماڵو ڕۆحت لەپێشتر بێ، لە نهێنیوئاشکرادا، موافیقی فەرمانی بی، پاشــان هەســت بەوپــەڕی کەمتەرخەمی بکەی بەرامبەری!

بیســتو دووەم: خۆشەویســتی، ئاورێکە لە دڵدا، ماسیوای مەحبووب، هەموو دەسووتێنێ!

بەشێوەیەك، کە لە دڵدا، جگە لە موورادی ئەو، هیچی دی نەمێنێ!

بیستو سێیەم: خۆشەویستی، پێشکەشکردنی تەواوی هەوڵو تەقەللایە، لەگەڵ وازهێنان لە گازندەو گلەیی، ئەمەش لە بەرهەمو مافی خۆشەویستییە!

بیستو چوارەم: دەبێ هێندە مەستو مەشغووڵی مەحبووب بێ، تا کاتی دیدار، ئەو تاسەو شەوقو مەستییە لا نەچێ، هەر بۆیە خۆشترین لەززەتی ئەوینداران لە بەهەشتا، دیداری ئیلاهییە!

بیستو پێنجەم: کەس وەپێش مەحبووبی خۆی نەخات، جڵەوی کاروباری خۆی، نەداتە دەست کەس، جگە لە ئەو.

بیستو شەشەم: چوونە ژێر ڕکێفی بەندایەتیو کۆیلایەتی بۆ مەحبووبو ڕزگاربوون لە کۆیلایەتیی ماسیوای ئەو.

بیستو حەوتەم: خۆشەویستی، سەفەری دڵە، وەدووی مەحبووبدا، ئاوێتەبوونی بەردەوامی زمانە، بە یادی ئەو.

ئیبنولقەییمیش دەڵێ: سەفەری دڵ، واتە: شەوقی دیدار، ئاوێتەبوونی زمانیش بە زیکری مەحبووب، بێگومان ئەوەی کەسێکی خۆش بوێت، هەمیشە زۆر یادی دەکا!

بیستو هەشتەم: خۆشەویستی، نە بە جەفا کەم دەکات ونە بە وەفا زیاد دەکات!

کەواتە: نە جەفای مەحبووب، کەمی دەکات، نە چاکەی مەحبووبیش، زیادی دەکات!

بیستو نۆهەم: مەحەببەت وەهایە، کە بە کوللەن مەشغووڵی مەحبووبی خۆت بی، هەموو شتێکیشت، لە پێناویدا بەخت بکەی! چیت هەیە، هەرچییەك کە هەتە!!

سیهەم: کە ئیبنولقەییم ئێژێ: جامیعی هەموویەتی، ئەبوبەکری کیتتانی دەڵێ: لە شاری مەککە، لەنێو زانایاندا، باسووتاریفی مەحەببەت هاتە پێش، بە "جونەیدی بەغدادی"یان گوت، کە لە هەموویان چکۆلەتر بوو: دەی تۆ، چیت هەیە بیڵێ ئەی عێراقی. ئەویش سەری داخستو چاوەکانی پڕ بوون لە فرمێسك، پاشان سەبارەت بە ئەوینداریی ڕاستەقینە گوتی: (بەندەیەکە، خۆی لەیاد چووەو پەیوەستە بە یادی پەروەردگاری، خەریکی جێبەجێکردنی فەرمانی وییەو بە چاوی دڵ تەماشای دەکات، دڵی بە نووری هەیبەتی ئیلاهی سووتاوە! شەرابی سافییە، لە پیاڵەی میهرو خۆشەویستیی خودایی، خوداوەند، پەردەی غەیبی بۆ بینینی حەقیقەت بۆ لا داوە، گەر قسە بکا، بە ویستی خودایە، ئەگەر بدوێ، لەبارەی خودایە، ببزوێ بە فەرمانی خودایە .. بوەستێ، هەر لەگەڵ خودایە.. ئەو بەندەیە، "بالله و مع الله"یە.)

ئامادەبوان، هەموو گریانو گوتیان: لەم وتەی تۆ زێتر نییە، ئەی تاجی عاریفان!!

سەبارەت بەو ڕێگایانەی، مرۆڤ دەگەیەنێت بە خۆشەویستیی خودا، ئیبنولقەییم (١٠) ڕێگا باس دەکات:

یەکەم: خوێندنەوەی قورئان، بە ڕامانو بیرکردنەوەو تێگەیشتن لە ماناکانی.

دووەم: نزیکبوونەوە لە خودا، بە ئەداکردنی "نەوافیل"و سوننەتەکان، دوای ئەنجامدانی فەرزەکان.

سێیەم: یادکردنی بەبەردەوامیو لە هەموو ئەحواڵێکا، بە زمانو دڵ، بە کردارو بە گوفتار، چون بەشی بەندە لە خۆشەویستیی، هێندەی یادکردنێتی بۆ خودا.

چوارەم: پێشخستنی خۆشەویستییەکانی خودا، لەسەر شاوەتو ئارەزوو، وێڕای هەڵکشان بەرەو ئەوینی خودایی، هەرچەندە ڕێگا سەخت بێ!

پێنجەم: موتاڵای دڵ بۆ ئەسمائی حوسناو سیفاتی عولیای خوداوەندو زانینو بینینی شوێنەواریان.. ئەوەی خودا بناسێ لە ڕێگای ئەسمائی حوسناو سیفاتی عولیاوە، بێگومان خۆشی دەوێت.

شەشەم: بینینی چاکەو فەڕو بەرەکەت و نازونیعمەتەکانی خودا.

حەوتەم: لە هەمووی گرنگتر، شکان وملکەچبونی دڵە بەکوللی، لە بەردەستی مەحبووبدا.

هەشتەم: چوونە خەڵوەت لەگەڵ خودا، کاتی نزوولی ئیلاهی، لە سێیەکی کۆتایی شەودا، ئەو کاتەی لەژێر باڵی ڕەشی شەوا، خۆشەویستانی خودا، بۆ موناجاتو تیلاوەی کەلامی خودا، دەچنە نێو ژوانی ئەوینی خودایی، بە تەواوی ئەدەبو خشووعو ملکەچیو ئەوینەوە، لە خزمەتی پەروەردگاری مەزندا، دەوەستنو بە چرپەی دڵ، ڕازونیازی خۆیانی عەرز دەکەن، لە کۆتا ساتەکانی ئەسحاریشدا، بە فرمێسكو گریانو ئیستیغفارەوە، ماڵاوایی لەو ژوانە شکۆدارە دەکەن.

نۆیەم: چوونە نێو کۆڕو مەجلیسی ساڵحانو پیاوچاکانو ئەویندارانی ڕاستگۆو بەهرەمەندبوون لە وتەی جوانو حیکمەتو داناییان، گوێگرتن لە خزمەتیانداو قسەنەکردن، تەنها کاتی پێویست نەبێت.

دەیەم: دوورکەوتنەوە لە هەموو هۆکارێك، کە دەبێتە هۆی دوورکەوتنەوەی دڵ لە خودای گەورە.

ئازیزم، بەم هۆکارانە، ئەوینداران گەیشتن بە پلەوپایەو مەنزڵگاکانی مەحەببەتی ئیلاهی.. بەڵام سەرەتا، دەبێت ڕۆح، ئامادەی ئەم گەشتە بێو چاویش شارەزای ڕێگا.

بە ئومێدی دیدار، بە خودات دەسپێرم...



# لەگەڵ تۆراوی شاعیردا

مەلا ڕەسووڵی عەتووفی، کە لە بنەماڵەیەکی عیلمیو لە عەشیرەتی "بریەجی"یە، لە ساڵی (١٩٣٤ز)، لە گوندی بێشاسپیی سەر بە شاری سەردەشت، هاتۆتە دونیاوەو دوای تێپەڕینی دەوری منداڵیو خوێندنی کتێبە وردەڵەکانی سەرەتایی، بەهاری ساڵی (١٩٤٦ز)، شوێن خوێندنی ئایینی کەوتووەو لە ماوەی پازدە ساڵدا، لە حوجرەکانی خۆرهەڵاتو باشووری کوردستان، خوێندنی ئایینی تەواو کردووە، لە کۆتایی ساڵی (١٩٦١ز)دا، لە لای پایەبەرز: (مامۆستا مەلا ساڵح کوڕی نەجیبی بێژوێ)، ئیجازەی مەلایەتیو خوێندنی وەرگرتووەو گەڕاوەتەوە بۆ گوندەکەی خۆیو ماوەی حەفدە ساڵ، سەرقاڵی وانەگوتنەوەو ئەرکی مەلایەتی بووەو دوایی هاتۆتە شاری سەردەشتو لەوێ ماوەتەوە.

بۆی گوڵی تۆ، دێتە لاەو غائیبە
لەو کەوێڵەی نێو دەروونم ڕاهیبە
بۆنی خۆشی، دڵ دەخاتە هەڵبەزە
وەك ئەوینی حەقپەرستان، جازیبە
گیان پەپوولەی بێ چرا، کەوتۆتە خول
عیشقی ناکامە لەوی، بۆ حاصیبە
با بەسەر گوڵزاری تۆدا تێپەڕێ
بۆ خەزانی باغی ژینم کاسیبە
چی بکەم بۆ هاونیشینی لەحزەیەك
سەرێ نێمە گوڵخونی ئەو جالیبە
گەر بە قوربانی سەرم، بیدا لیقای
ئەو بە گیانی، بەو بەڵێنە ڕاغیبە
عیشقی دیداری تەوژمی سووتنی
بۆ هەموو ئاواتی غەیری زائیبە

باغەوانا! من پەنام هێنا بە تۆ
بۆ خەڵاتی شاگوڵی ئەو واهیبە
مەستی بۆنی عەتری عیشقی واقیعی
بوو، "تۆراو"ی خستە جەزبەو تائیبە

شاعیر لە ئەدەبی عیرفانیشدا، شیعری جوانی هەن، ئەمەش نموونەیەکی ئەو شیعرە بەرزانەیەتی:

بە دەستم گرتووە، هەگبەی سەفەر دەرچم لە نێو ژینم
قەراری لێ بڕیم، زامی دڵی پڕ ژانو پڕ تینم
لە سینەمدا، هەناسەم بۆتە تیشەی دەستی فەرهادێك
لە شاخی بێستوون باشتر دەتاشێ تەرحی شیرینم
دڵم بۆتە پەڕەی هەڵلاجو ئەعزام وا دەکا شانە
هەمووی پەیوەندی پچڕاوە، نەماوە نەزمو تەسکینم
لە دەستووری پزشکانو دەواو پارێز، بڕا چارەم
کلۆڵی بەخت بەستوویە، شەقامو دەرکی پێ ژینم
بەڵام هەگبەم بەتاڵەو بێزەوادو تۆشەیە داخم
لە کاتی کیشتو زەرعمدا، بە فیرۆ چوو هەموو ژینم
لە ئەو ڕێگەش، کە وا دوورو درێژو پڕ ئازارە
بەبێ یارو مەدەدکارێ، یەقینە سەخڵەتو تینم
دەبێ چۆن بچمە بازاڕی حیسابی کردەوەی عومرم
کە نەقدێکی سەحیحم پێ نییە، بۆ کاتی تەوزینم
لە حاڵێکدا هەموو عومرم، لە نافەرمانیدا ڕۆیی
لە بۆ داوای وەدیهێنەر، چ بەڵگێکی لەخۆ بینم
پەنام هێنا بە قاپی «مونتەقیم» بۆ بەخششو عەفوی
هەڵەو تاوانی «تۆراو»ێ، کە نەیگرت مێشکی تەلقینم